

# پلانی ستراتیژیی کەسیی


د. محمد مایمون

یوسف منافیخی

گۆڕینی بۆ کوردی

مەریوان عارف عەلی



کەشە



# پلانی ستراتیژیی کەسیی

د. مەحمد مایمون و یوسف منافیخی

گۆڕینی بۆ کوردی: مەریوان عارف عەلی

مرواری ناکەوێتە سەر ئاو، بۆ بەدەستهێنانی دەبێت بچینە قوڵایی ئاوەکانەوە، ژیانیش پێکهاتووە لە کۆمەڵێك دەرفەت، دەرفەتەکانیش لە دەرگای کەس نادەن، بۆیە ئەوەی دەیەوێت بەدەستیان بهێنێت پێویستە خۆی ماندووکات.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پلانی ستراتیژیی کەسیی

نوسینی: د. محمد مایمون و یوسف منافیخی

گۆڕینی بۆ کوردی: مەریوان عارف عەلی

پێداچوونەوەی: شیرین صالح ، بەڵێن طه

دیزاین: عیماد عبدالقادر

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

نۆبەی چاپ: یەکەم ٢٠٢٠

چاپکردن: کتێبخانەی گەشە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٩٣٢)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

ktebxanaigasha

0750 121 4773

گەشە

# پێشەکی

لـە جیهانـی ئەمڕۆدا پـلان بە یەکێک لـە بابەتە گرنگـەکان دادەنرێـت، بۆ تـاک و دامەزراوەو کۆمپانیـاو حکومەتـەکان و هەر شـتێکی دیکـە، کە پەیوەنـدی بە پەرەپێدانـەوە هەبێت.

پلاندانانیش زۆر بە سادەیی بریتیە لە: کاردانەوە بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت.

ئەسـتێرەی بابـەتی پلاندانـان لە حەفتاکان و هەشـتاکانی سـەدەی رابـردوودا درەوشـایەوەو، ئـەم پرسیارانەیشـی بـەدوای خۆیدا هێنا: ئایـا پلاندانان داهێنـان و نوێگەری سـنوردار دەکات؟ ئایـا پلاندانـان دەسـەڵاتەکانی کارگێـڕی بـاڵا سـنوردار دەکات؟ ئایـا پلاندانـان دەبێتـە هـۆی کەمکردنـەوەی مرونەت؟ ئایـا پلاندانان دەبێتە هۆی نەهێشـتنی خێرایی تێگەیشـتن (الحدس)؟

دواتـر لایەنگـرانی پلان و پلانی سـتراتیجی وەڵامیان دایـەوە و، کتێـب دوای کتێب دەکەوتە بـازاڕەوەو باسـیان لـە گرنگـی و بایەخـی پلاندانـان دەکـرد و، ئەوەیـان روون دەکـردەوە کـە پلاندانـان بزوێنـەرەکانی ژیـری و توانـای تێگەیشـتن دەجوڵێنێـت و لەنـاوی نابات.

چیـرۆکی لەدایکبـوونی ئەم کتێبەش هەر لێرەوە دەسـتی پێکرد و، ویسـتی بـەم کارە کتێبخانەی پەرەپێدان و کارگێڕی دەوڵەمەندتر بکات، لەڕێگای خوێندنەوەیەکی وردو لەسـەرخۆی کتێبەکەوە بۆمـان روون دەبێتـەوە بەڕێگایەکی ئاسـان و زمانێکی پـاراوو رەوان نـوسراوەو کۆمەڵێك راهێنانی باشـی تیـادا خراوەتـە ڕوو، کـە یارمـەتی خوێنـەر دەدات بـە تـەواوی لـە بیرۆکـەکان تێبـگات و، پێویسـتی بـە ژمارەیـەکی زۆر لەو کتێبانـە نەمێنێت کە پێشـتر نوسراون.

ئـەم کتێبـە راهێنانێـکی کردارییـە و، بەهایـەکی گـەورەی ئەوتـۆ بـۆ هەمـوو کەسـێك زیـاد دەکات کـە ناتوانێـت دەسـتبەرداری بێـت، متمانـەی تـەواوم بـەوە هەیـە کـە ژمارەیـەکی زۆری خەڵـك بەتـەواوی سـوودمەند دەبن لـەو بیرۆکانەی تیایدا باسـکراون و، بەیەکێـك لە گرنگترین ئـەو بابەتانـە دادەنرێـت کە پێویسـتە هەڵوێسـتەی لـە ئاسـتدا بکرێت.

بەرلـەوەی گەشـتەکەمان لەگـەڵ ئـەم نوسـینەدا دەسـت پێبکەین بەپێویسـتی دەزانـم ئەوەت بیربخەمـەوە کـە: بەرلەوەی بیر لـەوە بکەیتەوە ئامانجەکانت چین، پێویسـتە بەرپرسـیارییەکانت دیـاری بکەیـت، چونکـە هەتـا هەسـتنەکەیت لـەم ژیانـەدا بەرپرسـیاریەکت هەیـە نازانیـت چیبکەیـت، نازانیـت بۆچـی دەژیت، سـەرەنجام بیـر لەوە ناکەیتـەوە ئامانجت هەبێـت و هەوڵ بـۆ هێنانەدییـان بدەیت.

ئەگەر ویستت تەنها یەك کتێب بخوێنیتەوە، ئەوە پێویستە ئەم پەرتووکە بخوێنیتەوە.

سەرۆکی ناوەندی ئەسکەندەنافی بۆ کارو پەرەپێدان لە کەنەدا

**د.ئەحمەد سائد ئەلزەین**




# ڕێخۆشکردن

کاتێـك دەسـتدەکەیت بـە دانـانی پـلان بـۆ ژیانـت، مانـای ئەوەیە ئـەو ژیانـەت ماناو مەبەسـتێکی هەیـە و، دەتەوێـت پێـی بگەیت.

ئامانـج لـەم پەرتوکـەش بریتیـە لـە چانـدنی بیرۆکـەی پلاندانـان لـە ئـاوەزو ژیـری نەوەکانمانـدا، ئـەوەش دەگەڕێتـەوە بـۆ گرنگـی هەبـوونی پڕۆژەیـەکی تایبـەت بـە هـەر تاکێـکی ئـەم کۆمەڵگەیـە، کـە هـاوکار دەبێـت لـە پاڵپشـتیکردنی نەوەیـەکی چەکـدار بە پـلان و، هۆشـیار و تێگەیشـتوو لـە پێویسـتیەکانی کۆمەڵگـە، لەگـەڵ ڕوونکردنـەوەی ڕێـگاکانی دیاریکـردنی ئامانجـەکان و، دانـانی لەچوارچێـوەی پلانێـکی دیاریکـراودا، ئەمـەش هـاوکاری هەمـوو ئـەو کەسـانە دەبێـت کـە ئـەم پەرتوکـە دەخوێننـەوە.

پەرتوکەکـە کۆمەڵێـك هەنـگاو لەخـۆ دەگرێـت، کـە لـە ئامادەکـردنی پـلانی تایبـەت بەخـۆت و، پلاندانـان بـۆ ژیانـت یارمەتیـت دەدات، هەنگاوەکانیـش بریتیـن لـە:

**١- دەستنیشانکردن (تێگەیشتن لە خود): من کێم؟**

**٢- بەئامانجکردن (دانانی دیدگاو پەیام و ئامانج): چیم دەوێت؟**

**٣- پلاندانان: چۆن پلان دابنێم؟**

**٤- جێبەجێکردن: چۆن جێبەجێی بکەم؟**

**٥- هەڵسەنگاندن و چاککردن: گەیشتن بە پلانێکی تازەی ئامادەکراو بۆ کارپێکردن.**

پابەندبوونـت بـەم هەنگاوانـەو، هەبـوونی حـەزو خواسـتێکی بەهێزو، سـووربوونت لەسـەر بەدیهێنـانی ئامانجەکانـت، پشـتیوانت دەبێـت لـە پلاندانـان بـۆ هـەر پـڕۆژە یان بیرۆکەیـەك کـە لـە ژیانـدا هەتـە، وە ئەگـەر بەڕێگایەکی بـاش پلانـت دانا، ئـەوکات ئەو ئەنجامـەی دەتەوێـت بەدەسـتی دێنیت.

## " بە کەمر ڕازی مەبە، چونکە تۆ شایانی زۆر لەوە زیاتریت کە بیری لێدەکەیتەوە"

هەمــوو ســاتێکی ژیــان شــایانی ئەوەیــە زەردەخەنــەی بــۆ بکەیــن، تەنانــەت ئەگــەر ئــەو ســاتانەمان بەئازاریــش بــن، ئــەوە بەســە شــانازی پێــوە بکەیــن کــە خــوای گــەورە هەڵیبژاردویــن بــۆ ئــەوەی ژیــان بکەیــن.

دانــانی نەخشــەیەك بــۆ ژیانــت ڕێگایــەکی بەســودە بــۆ ڕونکردنــەوەی دیدگاکــەت، نەخشــەی ژیانیــش وێنەیــەکی بیــنراوی ئــەو شــتانەیە دەتەوێــت لــە ژیانــدا بیانهێنیتــەدی، ئەمــەش یارمەتیــت دەدات وابکەیــت خەونەکانت هەســتیان پێبکرێت، ئــەوەش لەڕێگای بەکارهێنــانی وێنەو ســیمبول، بۆئــەوەی خەونەکانت مۆرکی راســتەقینەییان پێوە دیاربێت.

هەروەهــا دیاریکــردنی کاتێــکی گونجــاو بــۆ هێنانــەدی ئامانجــەکانی ژیانــت، کــە ماوەکــەی لەنێــوان ســێ یــان پێنــج یــان حــەوت یــان دە ســاڵدا بێــت.

ئەگــەر بتوانیــت بۆ ئەم قۆناغــەی داهاتوی ژیانت نەخشــەی تێگەیشــتنێکی هەمەلایەنە دابنێیــت، ئایــا ئــەو تێگەیشــتنە چی دەبێت؟ (بــۆ نمونە: ئــەو ژیانە بژیم کە حــەزم لێیەتی، کارەکــەم ببەمــە قۆناغێــکی بەرزتــر، هاوســەری نمونەیــی ژیانــم بدۆزمــەوە، ...) دانــانی تێروانینێــك بــۆ ئــەو گۆڕانکارییــەی دەتەوێــت لــە قۆناغــی داهاتــووی ژیانتــدا ئەنجامی بدەیــت، هــاوکارت دەبێت ئامانجەکانــت لەبەرچاوبێــت و، کار بۆ بەدیهێنانیــان بکەیت.

بۆیــە هەر شــتێک دەمانەوێــت لە ژیانماندا بیهێنینەدی پێویســتە هەوڵــی بۆبدەین، نەك چــاوەڕێ بکەیــن بێتــە بەردەممان، چونکــە ئەوە ڕوونــادات، هەر خەونێکیــش کە خەونی پێــوە دەبینیــن پێویســتە لەچوارچێــوەی کاتێــکی دیاریکــراودا پــلانی بــۆ دابنێیــن و، لــەو ماوەیــەدا بــە لێبــڕان و مکوڕییــەوە هەوڵــی بەدەســتهێنانیان بدەیــن، ئەوەی لەنوســینی ئەم کتێبــەدا ویســتومە بیهێنمــەدی، بریتیە لە گەشــتن بە نەوەیــەکی زێڕین، کە بەهێــزەوە کۆڵی ژیــانی هەڵگرێــت و، شارســتانیەت بونیــاد بنێتــەوەو، بیگەیەنێت بە دۆخێــکی جیاواز.

ئەوەی وتی: ناتوانم، پێی دەڵێم: هەوڵ بدە،
ئەوەی وتی: نازانم، پێی دەڵێم: فێربە،
ئەوەی وتی: چاوەڕێ ناکەم، پێی دەڵێم: گەشبین بە،
ئەوەی وتی: پێم وانیە، پێی دەڵێم: تاقی بکەرەوە.

**ناپلیۆن پۆناپەرت**



# ئێستاش با پرسیارێکت لێ بکەم

## ژیان بەلای تۆوە چی دەگەیەنێت؟

وەڵامدانـەوەت بـۆ ئـەم پرسـیارە ئاماژەیە بـۆ بەهایەك، کە مـرۆڤ ژیانی خۆی لەسـەر ئـەم بەهایـە بونیـاد دەنێت، لەڕاسـتیدا مانای ژیـان زۆر گەورەتـرە لە هەموو ئەو شـتانەی لـە وەڵامی ئـەو پرسـیارەدا دەیانڵێیت و بیریـان لێدەکەیتـەوە!! مانای ژیـان زۆر گەورەترە لـە هەمـوو ئـەو دەسـتکەوتانەی بەدەسـتت هێناون، جا کەسـی بـن یان مـادی، هەروەها زۆر گەورەتـرە لـە داهاتـو و، پیشـە و، خێـزان و پەیوەندییەکانـت، گەورەترە لە سـەروەت و سـامان و ئەوەشـی کـە بەدەسـتی دێنیـت، گەورەتـرە لـە بڕوانامـەو شـارەزاییەکانت، گەورەتـرە لـە ئارامی زەینـی و تەنانەت بەختەوەریشـت!

چونکـە مانـای راسـتەقینەی ژیان بریتیە لە خۆشەویسـتی خوای مەزن و پەیوەسـتبوون پێیـەوە، خـوای پـەروەردگار لـە قورئانی پیـرۆزی خۆیـدا فەرمویـەتی: (مَا خَلَقْـتُ الْجِنَّ وَالْإِنْـسَ إِلَّا لِيَعْبُـدُونِ). الذاريات ٥٦.

لەبەرئـەوە بـا لەم ژیانەدا ئامانجی راسـتەقینەت زۆر لەو شـتانەی لەسـەرەوە باسـکران گەورەتربێـت، بـا تەرکیـزی سـەرەکیت لەسـەر ئەوەبێـت هاوسـەنگی لەنێـوان بـوارە جیـاوازەکانی ژیانتـدا رابگریـت، بەمـەش تـۆ دەتوانیت کەسـێکی جیاوازبیـت و بگەیت بەئامانجـی دونیـاو دواڕۆژیشـت، نەك وەك ئـەوەی هەندێك لە کەسـە سـەرکەوتووەکان دەیکـەن و، پێیـان وایـە پـارەو تەکنەلۆجیـا نهێنی پشـت ئەو سـەرکەوتنەیە کە بەدەسـتیان هێنـاوە، بۆیـە دەبینیـت ئەمانـە ناتوانـن چێـژی راسـتەقینەی ژیـان بکـەن، ئـەو خۆشـی و شـادییەی هەیانـە کاتییـەو بـە ماوەیەکـی کـەم هەمـووی کۆتایـی دێـت، بـەڵام ئەگـەر لەڕوانگـەی ئەوکەسـانەوە تەماشـای ژیـان بکەیـت کـە توانیویانـە هاوسـەنگی لەنێـوان بـوارە جیاوازەکانـدا رابگـرن، ئـەوە بـۆت روونـدەبێتـەوە کە:

**تەنها لەوێدا هەست بە مانای راستەقینەی ژیان دەکەیت،**

**تەنها لەوێدا لەمانای بوونت لەم ژیانە تێدەگەیت،**

**تەنها لەوێدا بەختەوەر دەبیت.**

لەگەڵ گزنگی هەموو بەیانیەکی ناو دارستانەکانی ئەفریقادا، ئاسك خەبەری دەبێتەوەو، ئەوەی لەبەرچاوە کە ئەگەر نەتوانێت پێش خێراترین شێر بداتەوە، ئەوە چارەنوسی فەوت و تێداچوونە، شێریش خەبەری دەبێتەوەو دەزانێت ئەگەر نەتوانێت پێش خاوترین ئاسك بداتەوە ئەوە چارەنوسی لەبرسا مرداربونەوەیە.

جا شێر بیت یان ئاسك، پێویستە لەسەرت لەگەڵ گزنگی هەموو بەیانیەکدا لەوانی تر خێراتربیت، بۆ ئەوەی بە ویستی پەروەردگار سەرکەوتووبیت.

**" هەر دەبێت دەرگا و پەنجەرەکان بکەینەوەو، بچینە ژێر تیشکی خۆرو، پێشبڕکێ بکەین و، بەشی خۆمان لە سەروەت و سامانی دونیا بپچڕین"**

**ئایا دەتەوێت جێپەنجەی سەرکەوتنی خۆت لە ژیاندا دابنێیت؟**

**ئایا بڕیارت داوە بەرەو باشتر بگۆڕێیت و لە ژیانتدا بەرەو بڵندی بڕۆیت؟**





# پاشەکەوت بۆ داهاتووت بکە

«وارن بافت» دووەمیـن دەوڵەمەندتریـن پیـاوی جیهـان لەبـارەی خۆیەوە قسـەمان بۆ دەکات و دەڵێـت: بـەو پارەیـەی لەبەرامبـەر دابەشـکردنی ڕۆژنامـەو گۆڤارەکانـەوە وەرم دەگـرت، لـە تەمەنـی نۆ سـاڵیدا یەکـەم پشـکی کۆمپانیایەکم کـڕی و، لە تەمەنی سـیازدە ساڵیشـدا یەکـەم کێڵگـەی تایبـەت بـە خۆمم کـڕی، بۆیـە دەڵێـت: پاشـەکەوت بکەن و، منداڵەکانیشـتان هـان بـدەن پاشـەکەوت بکەن[1].

ئـەو کەسـانەی لـەڕووی داراییـەوە سـەرکەوتوون، بـەلانی کەمـەوە ٢٠٪ - ٥٠٪ی داهاتەکانیـان پاشـەکەوت دەکـەن.

ئـەی پـلانی تـۆ بـۆ پاشـەکەوتکردن چییـە؟ ئایـا هەتـا ئێسـتا بیرێکـت لـەو مووچەیـە کردۆتـەوە کـە لـەکاتی خانەنشـینبوونتدا وەری دەگریـت؟

## بارودۆخی وەبەرهێنانت بەگشتی چۆنە؟

ڕەنگـە لـەم سـاتەدا دەستپێشـخەریکردن بـۆ دانـانی پلانێکی چـاك و تۆکمـە بـۆ پاشـەکەوتکردن هەنگاوێـکی زۆر گرنگـی ژیانـت بێـت، بـەڵام پێویسـتە لەسـەرت هـەر ئێسـتا شـتێك بکەیـت، تەنانەت ئەگەر ئـەو هەنـگاوەی دەینێیت هەنگاوێـکی بچووکیش بێـت، ئەگەر هەر لەئێسـتاوە دەسـتت کـرد بەپاشـەکەوتکردنی ئـەو پارانـەی هەفتانە لێت زیـادە و، ئیشـت بۆ زیادکـردنی بڕەکەی کرد هەتـا دەگاتە ٢٠٪ی داهاتەکانـت، ئەوە ئەمە دەبێتـە یەکـەم هەنـگاوی ڕێگای سـەرکەوتنت.

بـەم هەنـگاوە دەسـت پێبکە، دواتر هەسـت بـە دەسـتکەوت و بەختـەوەری دەکەیت، لەبەرئـەوەی بەرەوڕووی ڕۆشـتویت.

---

(١) لەڕاسـتیدا ئێسـتا بەشـێکی زۆری بزنسـمانە گـەورەکانی دونیـا پێیـان وایە تەنها پاشـەکەوتکردن بـەس نییە، بەڵکـو پێویسـتە بیر لـە زیادکـردنی داهاتەکانیشـمان بکەینـەوە. (وەرگێڕ)

## ئەو ڕێوشوێنانە چین کە دەیانگریتەبەر بۆئەوەی دەست بە پاشەکەوتکردن بکەیت؟

لەوانەیە بۆ ئەم مەبەستە پێویستت بە بەکارهێنانی توانای داهێنانکاریانەی خۆت هەبێت، هەروەها دەکرێت لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیشتدا بیرۆکەکانت ئاڵوگۆڕ بکەیت.

ئەگەر هەستایت بە سادەکردنەوەی شێوازی ژیانت و، دەستت بە پاشەکەوتکردن کرد، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی بەم کارەت لەداهاتوودا ئازادی پلاندانانت هەبێت و، بچیتە سەر ڕێگای دڵنیایی و سەربەخۆیی دارایی.

## ئەی رات چییە ئەگەر ئەوەی پاشەکەوتی دەکەیت تەمەنت بێت؟!

- ئەگەر سپێدەی ڕۆژێکی نوێ هەڵهات و نەتدەزانی ئەمڕۆ چیدەکەیت، ئەوە بزانە تۆ لەکێشەدایت، ئەگەر چویتە سەر جێگاکەت و شتێك نەبوو بیری لێبکەیتەوە بۆئەوەی سبەینێ ئەنجامی بدەیت، ئەوە بزانە تۆ لە کێشەدایت.
- دەستبەتاڵی، شەکەتی، بێتاقەتی و بێزاری، خەمۆکی، هەمووی ئەنجامی بێپلانی یان پلاندانانی شکستخواردووە.
- ژیاننامەی کەسە سەرکەوتووەکان پێمان دەڵێت ئەوان چۆن پلانیان بۆ پرۆژەکانیان داناوە، ڕەنگە گەڕانەوە بۆ ژیاننامەی ئەو کەسانە لە دانانی پلانێکی سەکەوتوو بۆ پرۆژەکەت یارمەتیت بدەن.
- ڕەنگە بەتەنها دانیشتن لەگەڵ خۆت و بیرکردنەوە بتگەیەنن بەو ڕاستیانەی لێیان بێئاگایت و، بەرچاوت ڕوون بکەنەوە بۆ هەڵگرتنی هەنگاوەکانت بەرەو سەرکەوتن.
- بیرکردنەوەی دروست هەمیشە دەتگەیەنێت بە ئەنجامی دروست و، ڕێگای بەدیهێنانی ئامانجەکەت بۆ کورت دەکاتەوە، بیرت نەچێت ئەگەر ئەو خەونانە نەبوونایە کە لە سەرەتادا زۆر قورس و گران دەهاتنەپێشچاو، ئەوە نە ژیان پێشدەکەوت و، نە داهێنان و پێشکەوتنەکانیش دونیایان بەچاوی خۆیان دەبینی.

**لە گۆڕانکاریکردن مەترسە، بەڵکو چاوبڕە سەرکەوتن و بەرەوڕووی بڕۆ، ئەوکات دەبینیت خوای گەورەش پشتیوان و هاوکارتە، مادەم هۆکارەکانی سەرکەوتنت ئامادەکردووە، ئەوە دڵنیابە کە هەوڵەکانت بەفیڕۆ ناچن و سەردەکەویت.**



# گرنگی پلاندانان بۆ پڕۆژە تایبەتەکەت

لـە پەنجـاکانی سـەدەی رابـردوودا توێژینەوەیـەك لەسـەر ٥٠ خوێنـدکاری قۆناغـی کۆتایـی زانکـۆی هارڤـارد ئەنجام درا، پرسـیاری ئەوەیـان لێکرا: هەریەکێکیـان دوای ١٠ سـاڵی تـر دەیەوێـت ببێـت بەچی؟

وەڵامـــی هەموویان ئەوەبـــوو: دەیانەوێـــت لەدونیای ماڵ و داراییـــدا دەوڵەمەندو ســـەرکەوتوو کاریگەربن.

تەنها ١٠٪ی ئەو ١٠٠ کەسە ئامانجی دیاریکراوو نوسراویان هەبوو.

دوای ١٠ سـاڵ ئـەو ١٠٠ کەسـەیان هێنایـەوەو لە ژیانیـان کۆڵینەوە، بینیان سـەروەت وسـامانی ئـەو ١٠ کەسـەی ئامانجـی نوسراویـان هەبووە، لەکۆی سـەروەت و سـامانی ٩٠ کەسـەکەی تـر زیاتـرە کـە توێژینەوەیان لەسـەر کرابوو.

## چیرۆکی گەنجە 19 ساڵانەکە

لەکۆتاییـدا گەنجەکـە تـوانی بەسـەرکەوتوویی قۆناغـی ئامادەیـی تەواوبـکات، بـەڵام ئـەو خۆشـیەی رووخسـای هاوڕێـکانی داگیرکردبـوو لەسـەر رووخسـاری ئـەم نەبیـنرا، هەرچەنـدە تێکـرای نمرەکانیشـی زۆر بەرزبـوون و هەمـوو کۆلێجەکان وەریـان دەگرت. لەژوورەکـەی خۆی و لە کەشـێکی نیمچە تاریکدا دانیشـتبوو، ئەژنۆکانی لەسـەر سـنگی

توندکردبـو و بەهەردوو دەسـتەکانی گرتبـوونی، بەری بۆ بیرکردنەوەکانی شـلکردبوو، لەم کاتـەدا باوکی (بەهـۆی ئەو ئەنجامە باشـەوە کە کوڕەکەی بەدەسـتی هێنـاوە) بەڕوویەکی خـۆش و پـڕ لەشـانازییەوە خـۆی کـرد بەژوورەکـەدا، لەبەرامبـەر کوڕەکەیدا دانیشـت و لێـی پرسـی: کـوڕم چیتە؟ لەم ڕۆژەدا کـە سـاڵانێکی زۆرە چاوەڕێی دەکەیـن، ئەم هەموو خـەم وخەفەتـە چییە ڕووخسـارتی داگیـر کردووە؟

کوڕەکـە وەڵامـی دایـەوە: باوکـە نازانـم چیمـە، سـەرم لـێ شـێواوە، لـە ڕابـردوودا هەمـوو هەوڵێـکی خۆمم خسـتبووە گـەڕ بۆئەوەی بەرزتریـن نمرە بهێنم، سـوپاس بۆخوا لـەو کارەمـدا سـەرکەوتووبووم، بـەڵام ئێسـتا نازانـم لەچـی بوارێکـدا بخوێنـم و چـی بەشـێك هەڵبژێرم!.

بـاوکی بـەدەم زەردەخەنـەوە پێـی وت: کوڕی خـۆم، پێم خۆشـە ئەم قسـەیە دەکەیت، چونکـە ئـەوە بەڵگـەی پێگەشـتنی بیروهۆشـتە، لەبەرئـەوەی تـۆ وەك هاوڕێـکانی تـرت (بێئـەوەی بزانیـت ئاخـۆ لەگـەڵ تـۆدا دەگونجێـت یـان نـا) چـاوت لـەوە نیـە بچیتـە بەرزتریـن کۆلێـج، بۆیـە پێـت دەڵێـم: کوڕەکـەم، هـۆکاری ئـەم سـەر لـێ تێکچوونـەت دەگەڕێتـەوە بۆئـەوەی کـە ئامانجـت نییـە، لەکاتێکـدا دانـانی ئامانـج لـەم پرۆسـەی هەڵبـژاردنی کۆلێجـەدا یارمەتیـت دەدات، بۆیـە تەماشـای تواناکانـت بکە، تەماشـا بکەو بزانـە لەداهاتـوودا حـەزت لێیە ببیـت بەچی، ئینجا بیر لـە سـودوقازانجەکانی بکەرەوە بۆ ئـەو ژینگـەو کۆمەڵگەیـەی تیایدا دەژیت، بـەم شـێوازە لەبیرکردنەوە دەتوانیـت بگەیت بە باشـترین بـژاردەی دڵگیـری خۆت.

ڕەنگـوڕووی کوڕەکـە گـۆڕاو، زەردەخەنـەو خۆشـی ڕووخسـاریان داگـرت، خـەم و ناڕەحەتییـەکانی ڕەوینـەوە و، سوپاسـی بـاوکی کرد لەسـەر ئـەو ئامۆژگارییـە بەنرخەی.

**"ئەگەر زانیت چیت دەوێت، بەدەستهێنانی ئاسان دەبێت"**



# پلاندانان چییه؟

- بریتیـه لـه کێشـانی نەخشـە ڕێـگای داهاتـوو، بەئاڕاسـتەی ئامانجێـکی دیاریکـراو، لەکاتێـکی دیاریکـراوو، بـە مواسـەفاتێکی دیاریکـراو.
- بەستنەوەی ئامانجەکانە بەکاتێکی دیاریکراوەوە.
- چـی دەزانیـت لەبارەی دۆخـی ئێسـتات؟، دەتەوێت لەداهاتـوودا چۆن بیـت؟، دواتر شـارەزایی و زانیـاری و لێهاتوویەکانـت بـەکار بهێنـە، بۆئـەوەی بگەیـت بـەوەی لـە داهاتـوودا دەتەوێت.
- دیزایینکـردنی وێنەیەکـە بـۆ داهاتوویـەکی چاوەڕوانکـراو و، ئاشـکراکردنی ئـەو ڕێگایانـەی دەتگەیەنێتـە ئـەوێ.
- بڕیـاردانی ئێسـتایە لەبـارەی ڕووداوێـکی داهاتـووەوە، هەڵبـژاردنی جێگرەوەیەکـە لەناو کۆمەڵـە جێگرەوەیەکـدا، بـۆ ئـەوەی لەداهاتـوودا جێبەجـێ بکرێـت.
- بەوردی دیاریکردنی ئەو شتانەیە کە دەمانەوێت لە داهاتوودا ئەنجامیان بدەین.

## سوودو ئەنجامەکانی پلاندانان

- دەبێتە هۆی دیاریکردنی ئاڕاستەو، ڕێکخستنی هەوڵەکان و، کورتکردنەوەی کاتەکان.
- بۆ ئەنجامدانی کارەکانت پێوەرت دەداتێ.
- نیشانەکانی ڕێگا ڕوون دەکاتەوە.
- بەمرۆڤ دەڵێت چی دەوێت و، دۆخی ئێستاو داهاتووی بۆ ڕووندەکاتەوە.
- دەبێتە هۆی هاندانی مرۆڤ و، زیادکردنی بەرهەمەکانی.

- هـاوكاری مـرۆڤ دەكات بـۆ ئاشـنابوون بـە كێشـەو بەربەسـتە چاوەڕوانكـراوەكان، بۆئـەوەی نەیـان هێڵێـت یاخـود كەمیـان بكاتـەوە.
- یارمـەتی مـرۆڤ دەدات بەباشـترین شـێوە سـوود لـە توانـاو سـەرچاوە مرۆییـەكان وەرگرێـت.
- هاوكاردەبێـت لـە هەماهەنگـی نێـوان چالاكییـە سـەرەكیی و پێویسـتەكان و چالاكییە لاوەكیـەكان.
- هاوكاردەبێـت لـە دابینكـردنی ئارامـی دەروونی بـۆ مـرۆڤ و، دووری دەخاتـەوە لـە دڵەراوكـێ و نیگەرانییـەكانی داهاتـوو.

## خەڵك بۆچی پلان دانانێن؟

- گەشبینی زیاد لەپێویست دەربارەی ئەو دۆخەی ئێستا تیایداین.
- بێئاگایی لە گرنگی پلان و ئەنجامەكانی.
- سەرنج و تێڕوانینی خراپ و هەڵە لەبارەی پلانەوە.
- بێتوانایی لە دانانی پلاندا.
- نەزانینی كارە گرنگ و لەپێشترەكان و، ڕێكخستنیان بەگوێرەی گرنگیان.
- بوونی ڕێگری كۆمەڵایەتی و ژینگەیی.
- ترس لە نادیار.
- ناجێگیری و بێئارامی.

**ڕاهێنـان: لەڕوانگـە و تێڕوانینـی خۆتەوە سـێ هۆكاری تر بنووسـە كـە وادەكات خەڵك پـلان دانەنێن.**

١- ...............................

٢- ...............................

٣- ...............................

**بیربكەرەوە ... پلان دابنێ ... كار بكە ... جیاوازبە**

**خەونەكانی دوێنێ ڕاستیەكانی ئەمڕۆن**

**خەونەكانی ئەمڕۆش ڕاستیەكانی سبەینێن**



# تایبەتمەندییەکانی پلاندانەرە سەرکەوتووەکان

١- بزانـە ئـەم تایبەتمەندیيانـە بـەرز یـان مامناوەنـد یـان لاوازن لەتـۆدا، لـەو خشـتەیەی خـوارەوەدا ڕێـژەی سـەدیەکەی بنووسـە.

| ژ | تایبەتمەندی | ڕێژە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | ڕێکخستن | ٪ | |
| ٢ | داهێنان (دۆزینەوەی بیرۆکەی تازەو بەسوود) | ٪ | |
| ٣ | مرونەت لە پلاندانان و دۆزینەوەی جێگرەوە و بژاردە | ٪ | |
| ٤ | توانای جیاوازبوون و کێبڕکێ | ٪ | |
| ٥ | کرداریی (کەسێکی کرداری و واقعی) | ٪ | |
| ٦ | متمانە بەخۆبوون | ٪ | |
| ٧ | دەستپێشخەربوون (سەرباری ئاڵنگاری و سەختیەکان) | ٪ | |
| ٨ | هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوان کاروبارەکاندا | ٪ | |
| ٩ | حەزی شت زانین (پرسیاری زۆرکردن) | ٪ | |
| ١٠ | بیرکردنەوەی ئەرێنی (خۆرزگارکردن لە نەرێنی و کۆسپەکان) | ٪ | |
| ١١ | دیدگای نوسراو | ٪ | |
| ١٢ | هاوکاری | ٪ | |

٢- لـەو خەسـڵەتانەی سـەرەوە کام سـێ دانەیـان لـەوانی تـر گرنگـترن بـەلای تـۆوە، دیاریـان بکـە:

.............................................................................................................

٣- لەو خەسـڵەتانەی سـەرەوە سـێ دانەیـان دیاری بکە کـە لەهەموو خاڵـەکانی تر زیاتر پێویسـتت بەوەیـە خۆتیان تێدا باشـبکەیت:

## کێ لەئێمە نایەوێت هەندێك شتی ژیانی بگۆڕێت؟

### چیرۆکی هەڵۆ

هەڵـۆ یەکێکـە لـە بەتەمەنتریـن جـۆرەکانی باڵنـدە، ٧٠ سـاڵ دەژی، بـەڵام بۆئـەوەی بتوانێـت ئـەو ٧٠ سـاڵە بژی، کاتێـك دەگاتە تەمەنی ٤٠ سـاڵی پێویسـتە بڕیارێکی قورس بـدات، نینۆکـەکانی کـە سـەرچاوەی دەسـتکەوتنی خـۆراکی ڕۆژانەیـەتی، دەچەمێتـەوەو چیـتر وەك جـاران توانـای ڕاوکـردنی نێچیـرەکانی نامێنێـت، دەنوکـە بەهێـزە تیـژەکانی زۆر دەچەمێتـەوە، بەهـۆی زۆری تەمەنیـەوە پـەڕی باڵـەکانی قـورس دەبـن و بەسـنگیەوە دەنوسـێن و، ئیـتر فڕیـن بۆئـەو زۆر قورس و گران دەبێـت، ئەم بارودۆخـە هەڵۆکە دەخاتە بـەردەم دوو بـژاردەوە:

- یان ئەوەی خۆی بدات بەدەستەوەو بمرێت.
- یاخود خۆی بخاتە ژێر پرۆسەیەکی گۆڕانکاری پڕئازاری ١٥٠ ڕۆژییەوە.

پرۆسـەکەش بەوجۆرەیـە کـە هەڵۆکـە دەبێـت بـەرەو لوتکـەی ئـەو چیایـە بفڕێـت هێلانەکەیـی لێیـەو، لـەوێ بەتونـدی دەنـوکی بکێشـێت بـە بـەردداو، هەتاوەکـو بەشـە چەماوەکـەی دەشـکێنێت، دوای ئـەوە چـاوەڕێ دەکات هەتاوەکـو سـەرلەنوێ دەنـوکی دەردێتـەوە، پاشـان نینۆکـەکانی دەشـکێنێت، دوای ئـەوەی نینۆکـەکانی دێنـەوە، ئینجـا دەسـتدەکات بـە هەڵکێشـانی پـەڕە کۆنـەکانی جەسـتەی، دوای پێنـج مانـگ هەڵۆکـە دەفڕێـت و گەشـتی دووەمـی ژیـانی دەسـتپێدەکات، ڕێـك وەك ئـەوەی تـازە لەدایـك بووبێـت... بـەوەش ٣٠ سـاڵی تـر دەژی.



# بۆچی پێویستت بەگۆڕانکاریی کردنە؟

زۆربـەی جـار، بۆئەوەی خۆمـان لەگـەڵ ژینگەکەمانـدا رابهێنیـن، پێویسـتمان بەوەیە خۆمـان بگۆڕیـن، دەزانـم لەوانەیە ئەم پرۆسـەی گۆڕینـە ناچارمان بکات دەسـتبەرداری یادەوەرییـە کۆنـەکان بین، وازبێنیـن لـەو داب ونەریتانەمان کە لەناخماندا رەگوڕیشـەیان داکوتـاوە، بـەڵام هەرکاتێـك خۆمـان لـە کـۆت وبەنـدەکانی رابـردوو رزگارکـرد، ئیـتر دەتوانیـن سـوود لـە ئێسـتامان وەرگریـن و، پـلان بـۆ داهاتوومـان دابنێین. بـەڵام ئەگەر بەڕاسـتی دەمانەوێـت گۆڕانـکاری لەخۆمانـدا ئەنجـام بدەیـن ئـەوە پێویسـتە پابەنـدی ئـەم خاڵانـەی خوارەوەبیـن، خـۆ ئەگـەر تـۆ لـەو کەسـانەیت کـە ئامادەنیـن ئـەم خاڵانە لـە ژیانیانـدا جێبەجـێ بکـەن، مانـای وایـە ئامـادە نیـت ئـەم گەشـتەمان لەگـەڵ ئەنجام بدەیـتو، تەنهـا خەریکـی خوێندنـەوەی پەرتووکێکیـت و هیچـی تـر.

## یەکـەم: ڕێکـەوتـن لەسـەر چەنـد بنەمایەکـی سـەرەکی، کـە بریتیـن لـە:

### ١- پابەندبون بە گۆڕانکارییەوە:

کەسـێك حەزوخواسـتی لەگۆڕانـکاری نەبێـت چـۆن دەگۆڕێـت؟ بۆیـە پێویسـتە حەزێـکی قوڵـت هەبێـت بـۆ ئەنجامـدانی گۆڕانـکاری لەخۆتـدا، ئـەوەی گۆڕانـکاری لەخۆیـدا نـەکات نەخۆشـدەکەوێت و تووشـی خەمۆکی دەبێـت، بنەمای دروسـتکردنی

گۆڕانـكاری لەخـوددا ئالێـرەوە سـەرچاوەی گرتـووە.

**لێرەوە كاری راستەقینە دەستپێدەكات!!!**

بۆچـی؟ لەبەرئـەوەی تێدەگەیت گۆڕانكارییـەك هەیە هەر دەبێـت لەژیانتدا روودات، جـا گۆڕانكارییەكـە لـە كـردنی كارێكـدا بێـت كـە چیـتر تواناوسـەلیقەی ئەنجامدانیـت نەمـاوە، یاخود لە كێشـی زیادەدابێت كە بیـزاری كردویت!! یاخود لـە هاوڕێیەتیەكدابێت كـە جگـە لە زیـان هیچ سـوودێكی بۆت نەبـووە!! یاخود گۆڕانـكاری بێت لـە نەریتێكی زۆر خراپـدا، یاخـود گۆڕانـكاری بێـت لـە تورەییـەكی زۆر و، شـتی دیكـەی لـەم جـۆرە رەفتـارە خراپانـە كـە سـاڵانێكی زۆرە لەگەڵیانـدا دەژیـت و، وایـان لێهاتـووە بوونەتـە بەشـێك لـە ژیانـی تۆ، بێ ئـەوەی رۆژێك بێیت دانیشـیت و، بەڕاسـتی بیـر بكەیتەوە لەو ئـازارو دەردیسـەری و زیانـە زۆرانـەی ئەوشـتانە لەژیانی تۆدا دروسـتیان كـردووە. جا بۆ ماوەیـەكی كـەم بووبێت یـان زۆر.

وابزانـم ئێسـتا ئیـتر لـەوە تێگەشـتویت گۆڕانـكاری پێویسـتە روودات، بەمـەش لەو خەونـە قوڵـە خەبـەرت دەبێتـەوە كـە تیایدابویـت و، دەسـتدەكەیت بـە بیركردنـەوە لـە چۆنێتـی هاتنـەدەرەوە لـەو ئاسـتەنگانە و، كاری راسـتەقینە ئەنجام دەدەیـت، ناڕەحەتی و ئاڵنگارییـەكان هەرچـی و هەرچۆنـبن لەسـەر كاری خـۆت بـەردەوام دەبیـت و، واز لەو رێـگای گۆڕانكارییـە ناهێنیـت كە دەسـتت پێكـردووە.

تەنهـا لێرەوە كاری راسـتەقینەی تۆ دەسـتپێدەكات، لێرەوە ئەو توانا بێسـنورانەی خوای گـەورە پێـی بەخشـیویت بەكاریـان دێنیـت، كە بریتیـن لە هێـزی زەین و ژیـری و ئاوەز و لێكۆڵینەوەو شـارەزاییەكانی ژیانت.

لێرەوەیـە بیركردنـەوەی ئەرێنـی و كـرداری ئەرێنی دەسـت پێدەكـەن، كاری راسـتەقینە دەسـت پێدەكات، كاتێكیش هەسـتدەكەیت لەبەردەم دووڕیانێكدا وەسـتاویت و نازانیت بـەكام رێگەیانـدا بڕۆیـت، پشـت بەخـوای مـەزن دەبەسـتیت و، بەشـێوازێكی ئەرێنیانـە بیردەكەیتـەوەو، توانـا و كارامەیـی و لێهاتووییەكانـت بـەكار دێنیـت، تەنهاو تەنهـا لێرەوە گەشـتە راسـتەقینەكەت دەسـت پێدەكات! گەشـتی سـەركەوتن، گەشـتی بەختەوەری.

**جاری وا هەیە دەكەوینە بەردەم دووڕیانێكەوە، ئەگەر خۆمان ئەو ئاڕاستەیە هەڵنەبژێرین كە دەمانەوێت، ئەوە چارەنوس دەمانداتە دەست شەپۆلەكانی ژیان و، كوێی بوێت فڕێمان دەداتە ئەو گۆشەیەی ژیانەوە.**

### ٢- گۆڕانكاری لەناوەوە دەستپێدەكات :

ئێستا ئەمە بووەتە دروشم كە: هەتا ئەوكاتەی لەناخی خۆماندا گۆڕانكاری دروستنەبێت، لەدونیای دەرەوەدا هیچ شتێك ناگۆڕێت، كەواتە دروستبوونی گۆڕانكاری لەناوەوەی خۆماندا یەكەم هەنگاوی دروستە بەرەو ئەنجامدانی گۆڕانكاری كاریگەر لەدونیای دەرەوەماندا.

«هیلین كیلر» دەڵێت: «ژیان یان سەركێشیكردنێكی ئازایانەیە یان هیچ ...چەندەها كەسمان هەیە دەبینێت و دەبیستێت، بەڵام لە دووتوێی لاپەڕەكانی مێژوودا بێ ناوو ناوبانگ ماوەتەوە، ... لۆمەی كەس مەكە، هۆكاری شكستت تەنها خۆتیت... ئەگەر ویستت دۆخی ئێستات بگۆڕیت، ئەوە دەبێت ئەوەی لەناختدایە بیگۆڕیت و سوودوەرگریت لە و بارودۆخانەی دەوریان داویت، بۆیە لۆمەی كەسانی تر مەكە».
ئەمە قسەی ئافرەتێكە نابیناو نابیست و ناگۆ بووە، بەڵام بەجۆرێك تەماشای ئەو بارودۆخەی خۆی دەكات كە لە بڕینی ڕێگای ژیاندا یەكێكن لەهاوكارو پاڵپشتەكانی.

**هیچكەس ناتوانێت بتگۆڕێت جگە لە: خۆت**

### ٣- ئەوە گرنگ نییە چیت لێ ڕوودەدات، بەڵكو گرنگ ئەوەیە ئەوەی لێت ڕوودەدات چی لێدەكەیت:

گرنگ ئەوە نییە نەكەویت، گرنگ ئەوەیە چۆن بتوانیت هەستیتەوە (ئەرێنی بە)، هۆكارە دەرەكیەكان (پارە، جوانی، پلەوپۆست، ڕەگەزنامە، خێزان، بنەماڵە)، هیچكام لەمانە كاریگەرییەكی ڕاستەقینەیان نیە لەسەر حەقیقەتی گۆڕانكاریی، كەسە سەركەوتووەكانی دونیاو چیرۆكی پێغەمبەران باشترین بەڵگەی ئەم قسانەمانن، ئەوە گرنگ نیە لەمناڵیدا چی بوویت و چۆن بوویت، گرنگ ئەوەیە ئێستا دەتەوێت ببیت بەچی و چیبكەیت.

### ٤- تۆ بەرپرسیت:

مادام توانای هەڵبژاردنت هەیە، نە بارودۆخ بەرپرسە، نە كەسانی دەوروپشتت، هەڵبژاردنیش پەیوەندی بەخودی خۆتەوە هەیە، كەواتە بەرپرسیارێتیەكە لە ئەستۆی خۆتدایە، بەم شێوازەی بیركردنەوە دەتوانیت سوودمەندبیت لەو بنەمایانەی لە پێشەوە باسمان كرد.

**٥- عەزیمەت (سووربوون) نهێنی سەرکەوتنە:**

لـە (سـان سـیمون)ی بیرمەنـدی فەرەنسـیەوە دەگێڕنـەوە خزمەتکارەکەیـی فێرکردبـوو هەمـوو بەیانیـەك کـە خەبـەری دەکاتـەوە پێی بڵێـت: «کۆنتی گـەورەم هەسـتە لەخەو... چونکـە کۆمەڵێـك ئـەرکی زۆر چاوەڕێـت دەکات لەپێنـاوی مرۆڤایەتیـدا ئەنجامیـان بدەیـت». جـا کـە ئەمـەی پێـدەوت دەسـتبەجێ بەوپـەڕی ورەو وزەو چوسـتوچالاکی و گەشـبینی و ئومێـدەوە هەڵدەسـتا، درکی بەگرنگـی خـۆی و گرنگـی بـوونی دەکـرد، بـۆ خزمەتکـردنی ئـەو ژیانـەی کـە چاوەڕێـی بەخشـینی شـتی زۆری لێـدەکات!

لەهەمـووی سـەیرتر ئەوەیـە ئەوکارەی «سـان سـیمون» ئەنجامـی دەدا چارەنوسسـازو مەترسـیدار نەبـوو، ئەو تەنهـا دەیخوێندەوەو دەینوسـی، هەروەهـا داوای لەخەڵك دەکرد ژیانێـکی شـەرەفمەندانە بژیـن، لەسـەر بنەمـای هـاوکاری و بەدەمەوەبـوونی یەکـتری بونیادنرابێـت، نەك ئەو ململانێ توندەی سیسـتمی سـەرمایەداری خولقاندوویەتی. بەڵام ئـەو بەتـەواوی بـاوەڕی بـەم ئامانجـە هەبـوو بـەدڵ و گیـان کاری بۆدەکـرد، خۆیی وەك سـەرچاوەیەکی بەخشـینی هیـوای ژیـان بەمرۆڤایـەتی دەبینی، بـەو ئومێـدەی دونیایەکی باشـترو جوانـتر و دڵگیرتر بـۆ ژیانکـردن بێتەگۆڕێ.

هەروەهـا (عبدالرحمـن سـودەیس) دەڵێـت: «کـە منداڵ بـووم دایکم هەمـوو رۆژێك بانگـی دەکـردم و دەیـوت: عبدالرحمـن وەرە قورئـانی پیـرۆز لەبـەر بکە، بۆئـەوەی ببیتە پێشـنوێژی مەکە!!

باشـە بۆچـی هەندێك لـە ئێمە بەچاوی سـووکەوە تەماشـای خۆمان دەکەیـن و نرخی خۆمـان نازانیـن؟!! بۆچـی ئامانـج بۆ ژیـانی خۆمـان دانانێین و بـە خۆمـان و جیهانیش بڵێیـن: ئـەوە هاتیـن بۆ هێنانـەدی ئامانجەکانمـان و، گۆڕینـی هەموو دونیا یان بەشـێکی بەرەو باشـتر.

ئەو سـاتانەی مرۆڤ هەستدەکات رۆڵ و پێگەیەکی هەیە لە خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و، دروسـتکردنی کاریگەری ئەرێنی لەکۆمەڵگە، هەسـتێکی ئەوەندە جوانە، کە خۆشـیەکانی لەبـاس نایەن. بەڵام پرسـیارەکە ئەوەیـە: چی ئامانجێکی گەورە چاوەڕێمانە؟! پرسـیارێکە لەوانەیـە بە مێشـکتدا بێت، بۆیە من بەوپـەڕی دڵنیاییەوە وەڵامت دەدەمـەوەو پێت دەڵێم: هەریـەك لـە ئێمـە دەتوانێـت ئـەوکارە مەزنە جوانـە بدۆزێتـەوە کـە دەتوانێت پێشکەشـی مرۆڤایـەتی بـکات، تەنهـا ئەوەنـدەی بەڵێـن بەخـۆت بدەیـت مرۆڤێـکی باشبیت، ئـەوە

خـۆی لەخۆیدا کارێـکی مەزنە...مرۆڤایەتی بەوپەڕی تامەزرۆییـەوە چاوەڕێت دەکات... ڕاپەڕانـدنی ئەرکـە پیشـەیی و کۆمەڵایـەتی و ڕۆحییـەکانی ڕۆژانەت، کارێـکی گەورەیە، زۆر کەمـن ئەوانەی بەباشـترین شـێوە ئەنجامیان دەدەن.

جیهـان بەتەمای ئەوە نییە بۆی ببیت بە ئەنیشـتاینی دووەم، یان ئەدیسـۆنێکی سـەردەم، یـان ئیـبن حەنبەلێکی هاوچەرخ، لەوانەیـە کارامەیی و لێهاتووییەکانت نەتوانن کەسـێکی وەك ئەوانـت لـێ دروسـت بـکات، بـەڵام خـۆ هیـچ نەبێـت بەهرەیەکـی جوانـت تێدایە بەهۆیـەوە بتوانیـت خزمەتێـکی جـوان پێشکەشـی مرۆڤایـەتی بکەیـت و، نـرخ و بەهای ژیانـت بزانیـت و، دەرکی ئامانـج لەبوونـت بکەیـت. پێگەیەکت لـەم ژیانـەدا هەبێت و، یەکێـك بیـت لە هاوکێشـەکانی ژیان، ئەمەش لەسـەر بنەمای ئەو شـێوازە لـە مامەڵەکردن دەبێـت، کە خـۆت بۆ ژیـانی خۆتت هەڵبـژاردووە!

جـا ئەگـەر بەو چاوەوە تەماشـای خۆتـت کرد کە تۆ کەسـێکی مەزنیت، ئـەو ڕوانینەی هەتـە لە هێـزی ئامانجەکەتـەوە سـەرچاوەی گرتبوو، ئەوکاتـە ئیتر هەموو دونیـا بەگوێت دەکەن.

بـەڵام کاتێـك تـۆ بەو چـاوەوە تەماشـای خـۆت دەکەیـت کـە کەسـێکی بێبەهایت و، لەگـەڵ ئـەو ملیۆنـان کەسـەی سـەرزەویان قەرەباڵغکـردووە هیـچ جیاوازییەکـت نییـە، ئەوکاتـە ئەگـەر ژیـان پشـتگوێی خسـتیت و بـاکی پێـت نەبـوو، نەیەیـت لۆمـەی ژیـان بکەیت:

هەسـتە ئـەی دۆسـت وەخەبەربـێ ... ئەرکێـکی زۆرت لەپێشـە دەبێـت پێشکەشـی مرۆڤایەتیـان بکەیـت.

هەسـتەو خـۆت پڕکـە لـە وزەوچالاکی بـۆ ئەنجامـدانی گۆڕانـکاری، لەم ڕێگایەشـدا بەئـارام و ئەرێنـی بـە، نەکەیـت نەرێنـی بیـت، چونکـە کێشـەی زۆربـەی خەڵـك ئەوەیە خـاوەنی ئیرادەیـەکی لاوازن، لەکاتێکـدا نهێنـی سـەرکەوتن ڕێـك پێچەوانـەی ئەمەیـەو، بریتیـە لـە ئیـرادەو مکوڕبوونێـکی بەهێـز. هیچ شـتێك ناتوانێت لەبـەردەم ئیـرادەدا خۆی ڕاگرێت، ئەوەی مکوڕتربێت سـەرکەوتووترە، کەسـی خاوەن ئیرادە بـە بینینی خەونەکانی دەسـتپێدەکات و، دواتـر هەتـا ئـەو دیدگایـەی دێنێتـەدی چاوی لەسـەری دەبێت.

## دووەم: هەندێك كەس، ئەگەر زۆربەیان نەبێت:

- لەژیاندا نازانن بەرەو كوێ ملی ڕێیان گرتووە، بەڵكو هەرگوێشی پێنادەن.
- كاتێك ناتوانن ئەو ڕێگاو هۆكارانە بدۆزنەوە كە دەیانگەیەنێتە داهاتوویەكی گەش، بێئومێد دەبن.
- دەیانەوێت لەم گەشتەی ژیاندا بەردەوامبن و، بەپلیكانەی سەركەوتندا سەركەون، بەڵام ناتوانن.
- هەوڵدەدەن لەڕێگای خوێندنەوەو راهێنانەوە لاسایی كاروكردەوەی كەسانی سەركەوتوو بكەنەوە، وادەزانن بەوە بەسەر كۆسپ و لەمپەرەكاندا زاڵدەبن، بەڵام لە واقعدا هیچ جوڵەیەك ناكەن.
- بە یەك شكستی بچووك توشی بێهیوایی و لاوازی ئیرادە دەبن و، پاشەكشە دەكەن لە ئامانجەكەیان و بەردەوام نابن.
- پێشبینیەكانی بەدیهێنانی سەركەوتن لای ئەم كەسانە كورت مەودایە (یەك هەفتە بۆ نمونە)، پاشان دەگەڕێنەوە سەر هەمان ئەزموونی پێشوویان.

**سەركەوتووەكان لە پێچی دەرفەتەكاندا بەدوای سەركەوتندا دەگەڕێن، ئەی ئەگەر دەرفەتەكان بەلایاندا تێپەڕێت دەبێت چی لێ دروست بكەن؟ ئەمەیە جیاوازی نێوان سەركەوتووان و شكستخواردووان.**

## سێیەم: هەڵسەنگاندنێکی خێرا بۆ گۆڕانکاریی

وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە، بەدانانی نیشانەی (✓) لە چوارگۆشەی بەرامبەر هەریەك لەو خاڵانەی خوارەوە، پاشان هەستە بەدەرهێنانی ئەنجامەکان بەو شێوەیەی خوارەوە:

| ژ | سفر (نەخێر) ١ (زانیم هەندێکجار) ٢ (بەڵێ زانیم) | هەڵبژاردن |
|---|---|---|
| ١ | بەرپرسیارێتی تەواوی ئەوشتانە لەئەستۆ دەگرم کە لەژیاندا دێنەڕێم | |
| ٢ | دەزانم هەمیشە بژاردەیەکم لەبەردەستدایە | |
| ٣ | هەڵوێستم ئەرێنیە بەرامبەر ژیان | |
| ٤ | کەسانی دیکە لە بەدیهێنانی ئەو شتانەی لەسەری ڕێکەوتوین پشت بەمن دەبەستن | |
| ٥ | من کەسێکی ئەمینم لەگەڵ خۆمدا و متمانەی پێدەکەم | |
| ٦ | ئازام و خاوەنی هێزێکی ناوخۆیی زۆرم | |
| ٧ | خۆم بەکەسێکی بەرپرس دەزانم و پابەندی بەڵێنەکانی خۆمم | |
| ٨ | لەکاتی پێویستدا دەتوانم بگەڕێمە دواوەو وێنە گەورەکە ببینم | |
| ٩ | بەتەواوی لە دەستکەوتەکانی ژیانم تێدەگەم | |
| ١٠ | من ئامادەم وانەی نوێ لە شکستەکانی ژیان فێربم | |

## ئەنجام (.........):

- (٢٠ - ٣٠): بەرپرسیارێتی لەئەستۆدەگریت و، لەسەر ڕێی گۆڕانکاری و بەئاراستەی دروستدا دەڕۆیت.
- (١٢ – ١٩ ): پێویستت بەوەیە هەوڵی زیاتر بدەیت بۆ لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی و گۆڕانکاری کردن.
- (٠ - ١١): پێویستت بەخستنەگەڕی هەوڵێکی زیاترو بەدواداچوون هەیە، بۆگەشتن بەوەی دەتەوێت.

**گەمژەییە بەردەوام هەمان شت دووبارە بکەینەوەو، چاوەڕێی ئەنجامی جیاوازیش بکەین. ئاڵبرت ئانیشتاین**



# چەند قۆناغێکی کرداریی بۆ دانانی پلانی ستراتیژی

پرۆسـەی دانـانی پلانێـکی تایبـەت بەئایینـدەی خـۆت لـە چەنـد قۆناغێـکی بنـەڕەتی پێکدێـت، کـە بریتیـن لەمانە:

## قۆناغی یەکەم: دەستنیشانکردن (خۆناسین)

مـن کێـم؟ ئێسـتا لەکوێدام؟ چیـم ئەنجـام داوەو چیم بەدی هێنـاوە؟ ئەو پەنـدو وانانە چیـن کـە لـە سـەرکەوتن و شکسـتەکانەوە فێریـان بـووم؟ ئـەو ڕۆڵانـە کامانـەن لەژیاندا پێیـان هەڵدەسـتم؟ توانـای پەرەپێـدان و بەرەوپێشـبردنی کامیانم هەیە؟

## قۆناغی دووەم: بەئامانجکردن (دیدگاو پەیام و ئامانج)

چیم هەیە؟ دەمەوێت لەکوێ بم؟

## قۆناغی سێیەم: پلاندانان

چۆن بگەم بەوەی دەمەوێت؟ چ دەرفەتێکم لەبەردەستدایە؟ ئەو جێگرەوە و بژاردانە کامانەن یارمەتیم دەدەن بۆ گەشتن بەوەی دەمەوێت؟ چۆن خشتەیەکی کاتی بۆ هێنانەدی ئامانجەکانم دادەنێم؟

## قۆناغی چوارەم: جێبەجێکردن

چۆن لەسەر هەنگاوە پێویستەکان بەردەوامبم؟ چۆن لەنێوان کارو کاتدا هاوسەنگی رابگرم؟ چۆن مرونەتم هەبێت؟

## قۆناغی پێنجەم: هەڵسەنگاندن و چاککردن

چۆن بزانم گەیشتووم بەوەی دەمەوێت؟ چۆن لەسەر رێگا دروستەکە بەردەوام بم؟ چۆن ئامانجەکانم باشتر بکەم، بۆئەوەی بەردەوام جیاوازبم؟

**سەرکەوتن کارێکی گرانە، لەوەش گرانتر چۆنێتی پارێزگاریکردن و برەودانە بەو سەرکەوتنە.**





# قۆناغی یەکەم

## دەستنیشانکردن (خۆناسین)

**پرسیاری یەکەم:** من کێم؟

**پرسیاری دووەم:** چیم بەئەنجام گەیاندووەو، چیم بەدی هێناوە؟

**پرسیاری سێیەم:** ئەو پەندو وانانە چین کە لە سەرکەوتن و شکستەکانەوە فێریان بووم؟

**پرسیاری چوارەم:** ئایا هیچ ئاڵنگارییەك هەیە گیرم خواردبێت بەدەستییەوە؟ چین؟

**پرسیاری پێنجەم:** پرسیارەکانی ئاشنابوون بە ژیان

**پرسیاری شەشەم:** چۆن سنورێك بۆخۆم دانێم و، چۆن بوەستم؟

**پرسیاری حەوتەم:** بەها تایبەتیەکانم چین؟

**پرسیاری هەشتەم:** پێشەنگ یان نمونەی باڵای ژیانم کێیە؟

**پرسیاری نۆیەم:** چۆن پیشەی گونجاوی تایبەت بەخۆم هەڵدەبژێرم؟

**پرسیاری دەیەم:** ئەو رۆڵانە چین کە لەژیانمدا ئەنجامیان دەدەم؟

## چەند هەنگاوێکی کرداریی بۆ بەڕێوەبردنی خۆت:

**ڕاهێنانی ١ :** خاڵە بەهێزەکانت.

**ڕاهێنانی ٢:** ئەو خاڵانەی پێویستیان بە باشکردن هەیە.

**ڕاهێنانی ٣:** ئاستەنگەکان.

**ڕاهێنانی ٤ :** دەرفەتەکان.

**ڕاهێنانی ٥:** بەراوردی ئەو خاڵانەی سەرەوە بکە.

**ڕاهێنانی ٦ :** دەستکەوت.

**ڕاهێنانی ٧:** مۆزەخانەی تایبەتی.

لـەم پەرتووکـەدا هەوڵدەدەیـن بەڕێوەبـردنی تەمـەن و، بەڕێوەبـردنی لەپێشـترەکان و، هەنـگاوە کردارییـە پێویسـتەکان بـۆ ئەومەبەسـتە کۆبکەینـەوە.

لـەم قۆناغـەدا وەڵامـی کۆمەڵێـك پرسـیاری گرنـگ دەدەینـەوە، وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارانەش پێویسـتیان بە کات و، تێرامان و، تەرکیز و، راسـتگۆیی لەگەڵ خوددا هەیە، لـەو کاتانـەدا کـە مێشـك روون و زوڵاڵـە و حەزێـكی زۆری بـۆ ناسـینی خـۆی و دانانی ئامانـج بـۆ داهاتـوو هەیە.

پێشـنیاردەکەین کاتێـك بـۆ ئـەم مەبەسـتە دیـاری بکەیـت، بـەڵام کاتژمێرەکـەی دیاری مەکـە، بۆئەوەی نەبێتە هۆی لەدەسـتدانی جـۆش وخرۆش و پاشـگەزبوونەوەت، چونکە کەمـی کات و پەلەپەلکـردن دەبنەهـۆی دروسـتکردنی پرسـیاری زۆرو، هەروەهـا گومان لەسـەر راست ودروسـتی وەڵامەکان دروسـتدەکەن.

پێویسـتە لـەکاتی پلاندانانـدا لە دۆخی ئێسـتامەوە دەسـت پێبکەم، بزانـم خاڵی بەهێزو لاوازو ئاسـتەنگ و دەرفەتـەکانی بەردەمم چین.

وەڵامدانـەوەی پرسـیارەکان لەسـەر بنەمـای بارودۆخـی ئێسـتات، نـەك بەوجـۆرەی پێتخۆشـە وابیت، یارمەتیدەرێکی باشـدەبن بۆ ئاشـنابوون بەخـۆت و تواناکانت و، دواتر دانـانی پلانەکـەت بەشـێوەیەکی دروسـت و کەوتنە سـەر ڕێگایەکی راسـت.

## پرسیاری یەکەم: من کێم؟

١- من کێم و ناسنامەم چییە؟

.................................................................................

.................................................................................

٢- ئەو ژینگەیەی تیایدا دەژیم کامەیە؟

.................................................................................

.................................................................................

٣- ئەو شتانە چین کە ئینتیمام بۆیان هەیە؟

.................................................................................

.................................................................................

٤- پیشەی ئێستام چییە؟

.................................................................................

.................................................................................

٥- گرنگترین ئارەزووەکانم چین؟

.................................................................................

.................................................................................

**ئەگەر بەکەمتر لەوەی شایستەی تۆیە رازی بویت، ئەوە کەمتر لەوەت دەستدەکەوێت کە شایستەتە.**



## پرسیاری دووەم: چیم ئەنجامداوەو، چیم بەدیهێناوە؟

١- گرنگترین ئەو پڕۆژانە کامانەن لەم چەند ساڵانەی دواییدا ئەنجامم داون؟

.............................................................................

.............................................................................

٢- ئەو کارانە کامانەن لەکاتی ئەنجامدانیاندا چێژم بینیوە؟

.............................................................................

.............................................................................

٣- نهێنی سەرکەوتنم لەو کارانەدا چیبووە؟

.............................................................................

.............................................................................

٤- خۆشترین ئەو ساتانەی پیایاندا تێپەڕیوم کامانەن؟

.............................................................................

.............................................................................

٥- چەند قازانجم کردووە؟

.............................................................................

.............................................................................

٦- ئەو نمرەیەی بەدەستم هێناوە چەندە؟

....................................................................................

....................................................................................

٧- ئایا شتی بەسوودم بەدەستهێناوە، یاخود خۆم رزگارکردووە لە کاروباری خراپ؟

....................................................................................

....................................................................................

٨- ئایا هەستاوم بەئەنجامدانی کارێکی تەندروستی یان وەرزشی یان رۆشنبیری جیاواز، یاخود لەسەر ئاستی پەیوەندییەکانم لەگەڵ خێزان و هاورێکانمدا شتێکی جیاوازم کردوە؟

....................................................................................

....................................................................................

٩- ئەو پەندو وانانە چین لەو دەستکەوت و سەرکەوتنانەوە فێریان بووم؟

أ - ............

ب- ...........

ت - ..........

١٠-هیچی لێوە فێربوویت؟ باسی ئەوەمان بۆ بکە کە دوای ئەوە دەتەوێت چیبکەیت؟

....................................................................................

....................................................................................

**کەسانی ورەبەرزو دڵکار(جدی)، وەك پاداشتێك بۆ ئەوکارانەی کردویانە، دوای هەوڵ و کۆششەکانیان زەردەخەنە بۆخۆیان دەکەن.**



## پرسیاری سێیەم: ئەو پەندو وانانە چیبوون کە فێریان بووم؟

١- ئاواتەخواز بویت چی بکەیت و نەتکردووە؟

..........................................................................

..........................................................................

٢- هیچ بەڵێنێکت داوە کە واز لە شتێك بهێنیت یان کارێك بکەیت و نەتکردبێت؟

..........................................................................

..........................................................................

٣- خۆشەویستێکت لەدەستداوە (کەس یان شت)؟

..........................................................................

..........................................................................

٤- بە ڕاستی بیرت لەپێکەوەنانی خێزان کردۆتەوەو ڕێك نەکەوتبێت؟

..........................................................................

..........................................................................

٥- پەیوەندییەکانت لەگەڵ خێزانەکەتدا تێکچووە؟

.............................................................................

.............................................................................

٦- ئەو تێکرای نمرەیەی بەدەستت هێناوە زۆر کەمترە لەوەی چاوەڕێت دەکرد؟

.............................................................................

.............................................................................

٧- رووداو یان شتێکی خراپ لێی رووداویت؟

.............................................................................

.............................................................................

٨- هۆکاری ئەو شکستانە چین؟

.............................................................................

.............................................................................

٩- بۆ روونکردنەوەی هۆکاری شکستەکانم چی بەخۆم بڵێم ؟ سەرقاڵم، هەرچەند هەوڵ بدەم هیچ بەهیچ ناکەم!

.............................................................................

.............................................................................

١٠-کاتێك بیر لە شکستەکانت دەکەیتەوە هەست بە ئازارو پەشیمانی و غەمباری و تورەیی دەکەیت، یاخود هەست بە هێزو کارامەیی و دانایی دەکەیت؟

.............................................................................

.............................................................................

١١-بۆچی باسی ئەم شتانە دەکەین؟

.............................................................................

.............................................................................

١٢-ئەو پەندو وانانەی لەو شکستانەوە فێریان بووم چین؟

أ- ...

ب- ...

ت- ...

١٣-بەڵگـەم چییـە لەسـەر ئـەوەی لـەو پەنـدو وانانـەوە سـوودم وەرگرتـووە و شـت فێربـووم؟

..........................................................................................

..........................................................................................

١٤-ئـەو رێنمایـی و ئامۆژگارییانـە چیـن کـە پێشکەشـی خۆمیـان دەکـەم، بۆئـەوەی جارێـکی تـر ئـەو هەڵانـە دووبـارە نەکەمـەوە؟

..........................................................................................

..........................................................................................

١٥-ئـەو گۆڕانکارییانـە چیـن کـە پێویسـتە لەخۆمـدا ئەنجامیـان بـدەم، بۆئـەوەی کاروبارەکانـم بەشـێوەیەکی باشـتر ئەنجـام بـدەم؟

..........................................................................................

..........................................................................................

١٦-ئایـا پێویسـتم بـە توانـاو لێهاتوویـی دیاریکـراو هەیە بـۆ تێپەڕانـدنی ئەم شکسـتانە؟ چین ؟

..........................................................................................

..........................................................................................

**تنۆکە ئاوەکان بەهۆی بەهێزییەکەیانەوە نیە کە بەرد کون دەکەن...**
**بەڵکو بەهۆی بەردەوامییانەوەیە**



## چۆن لەگەڵ شکستەکانمان مامەڵە بکەین؟

ئـەو شـێوازەی بـەکاری دێنیـت بـۆ بیرکردنـەوە لـە شکسـت، کاریگەرییـەکی زۆری دەبێـت لەسـەر ژیـان و تەندروسـتی و هەمـوو دەوروبەرەکەشـت!

غانـدی دەیـوت: «ئـەو زەینەی دەزانێـت چۆن واز لـە کۆنترۆڵکردن و بڕیاردان لەسـەر شـتەکان و تورەیـی بێنێـت، دەشـتوانێت چارەسـەر بـۆ کێشـەو ناڕەحەتییـەکانی ژیـان بدۆزێتـەوە، بـا زۆر قـورس و سـەختیش بن، ئـەوەش بە پەیڕەوکـردنی سـادەیی و ئارامی و بەختەوەریـی»

**بۆیە لەمڕۆ بەدواوە کاتێك رووبەڕووی هەر شکستێك دەبیتەوە، یاخود بیر لە هەر شکستێك دەکەیتەوە، بۆ رووبەڕووبوونەوەیان پەیڕەوی ئەم ستراتیجیاتانەی خوارەوە بکەوە:**

١- تێبینـی شکسـتەکە بکـەو بزانـە چـۆن چـۆنی بیـری لێدەکەیتـەوە، پاشـان لەڕێـگای هەسـتەکانتەوە خـۆتی لـێ دابـڕە.

٢- بیـر لـە باشـترین کەسـی داناو شـارەزا بکـەرەوە کـە دەزانیت لـەم دۆخـەدا دەتوانێت پشـتیوانیت بکات.

٣- لـەو کاتـەی بەهەسـتەکانت جیابویتەتـەوە لـە دۆخەکـە، بەوجـۆرە تەماشـای بکە کە لـەدورەوەو لەڕێـگای شاشـەیەکی گـەورە نمایـیش دەکرێـت.

٤- بەقوڵـی هەناسـە بـدەو لەگەڵ هەمـوو هەناسـەدانەوەیەکدا سـێ جار بڵێ «سـوپاس بۆخوا».

٥- ئـەو کەسـە داناو شـارەزایە بێنـەرەوە یادت کە رێـزی دەگریت و دەزانیت - بەویسـتی خـوا - دەتوانێـت بەدانایـیـەوە مامەڵـە لەگەڵ ئەم شکسـتەتدا بکات.

٦- بزانە ئەو کەسە دانایە چۆن لەگەڵ ئەم شکستەدا مامەڵە دەکات.

٧- پاشـان خـۆت بێنەپێشـچاو لەگـەڵ ئـەو دانایـەدا خەریـکی گفتوگۆیـت دەربـارەی

ئـەوەی لەگـەڵ ئـەم بارودۆخـەدا چـۆن مامەڵـە بکەیـت.

٨- وابێنە بەرچاو کە جارێکی تر توشی هەمان بارودۆخ بویتەوە، چیدەکەیت؟

٩- ئێستا پێم بڵێ چی لەم ئەزمونەوە فێربوییت، ئەوەی فێری بویت بینوسە.

١٠-بەرپرسـیارێتی تەواو لەئەسـتۆ بگرەو، چاوەڕێی چارەسـەرو گۆڕانـکاری لە دەرەوەی خـۆت مەکـە، بەڵکـو ئـەوەی فێـری بویـت بـۆ ئەنجامـدانی گۆڕانـکاری لـە خۆتدا بـەکاری بهێنە.

١١-ئـەوەی دەیکەیـت هەڵـی سـەنگێنە، گۆڕانـکاری تێدا بکەو، شـتی نوێی لێـوە فێربە، لەبەرئەوەی فێربوون بەسـوودە.

١٢-پاشـان جارێـکی تر بیخـەرەوە بواری کـردارەوە، بەمجـۆرە بەردەوامبە هەتـا دەگەیت بـە چارەسـەری گونجـاو و بەدیهێنانی ئەوەی مەبەسـتتە.

١٣-ئاسـتەنگ و چارەسـەرو ئەنجامەکـەش بنووسـە، بۆئـەوەی هەمیشـە پێـت بێـت و، لەژیانـدا تووشـی هـەر ئاسـتەنگێك بویـت بـۆی بگەڕێتـەوەو بـەکاری بهێنیـت.

**«شکست تەنها دەرفەتێکە بۆ سەرلەنوێ دەستپێکردنەوە بە زیرەکییەکی زیاترەوە»**

«تۆمـاس ئەدیسـۆن» لـەو ماوەیـەی ژیـاوە (١٨٤٧ - ١٩٣١) لـە زۆر بواردا شکسـتی هێنـاوە، لـەو کاتانـەی هەوڵـی دەدا بـۆ دۆزینـەوەی ئـەو شـتانەی دەیویسـت دونیای پێ بگۆڕێـت، هەزارەهـا جـار شکسـتی هێنـاوە، لـە سـاڵی (١٨٧٩)دا یەکـەم سـەرچاوەی روونـاکی پێشـکەش بەجیهـان کـرد، کـە بریتیبـوو لـە گڵۆپـی کارەبایـی، لەخـوارەوە ئەو وتەیـەی ئەدیسـۆن دادەنێم، کە تایبەتە بـەو دیدگایەی لەئەنجامی شکسـتەکانی رابردووی بـۆی دروسـتبووە، کردویـەتی بەخاڵی بەرەوپێشـچوون:

«بۆ بەدبەختی، زۆربەی ئەوکەسـانەی شکسـتدەهێنن بێئاگان لـەوەی ئەوکاتەی خۆیان دەدەن بەدەسـتەوە چەنـد لـە سـەرکەوتنەوە نزیکـن، ئەگـەر ١٠،٠٠٠ رێـگای بێکەڵکـم دۆزیبێتـەوە، ئەمـە ئـەوە ناگەیەنێـت کـە شکسـتم هێنـاوە، لەبەرئـەوەی لەهەریـەك لـەو هەڵانـەی کردوومـن هەنگاوێك لە ڕێگای فێربوون و سـەرکەوتن نزیکی خسـتومەتەوە».

**«مرۆڤە باشەکان لەڕێگای شکستەوە شارەزایی بەدەست دێنن»**



## پرسیاری چوارەم: ئایا هیچ ئاڵنگاری (تحدی)یەك هەیە بەدەستیانەوە گیرت خواردبێت؟

ئایا لەئێستادا بەدەست هیچ ئاڵنگارییەکەوە دەناڵێنیت؟ ئەگەر بەڵێ، ئایا پێتوایە ئەوەی ئێستا بەدەستیەوە دەناڵێنیت ئەنجامی ئەوکارانەیە لەرابردوودا ئەنجامت داون، یاخود باوەڕت وایە کەسانی ترو بارودۆخ هۆکارن؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە رەفتارو هەڵسوکەوتت بەرامبەر ئەو ئاستەنگیانە دیاری دەکەن، جا ئەگەر تۆ لەو کەسانەبیت کە هەر خەریکی سەرزەنشتکردن و بەراوردکردن و رەخنەگرتنن، ئەوە نەك هەر بارودۆخەکەت ناگۆڕێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە، خراپتردەبن و هەستە نەرێنیەکانت زیاتر دەبن، بەڵام ئەگەر هەر بەڕاستی دەتەوێت گۆڕانکارییەکی باش لە ژیانتدا ئەنجام بدەیت، ئەوە دەبێت لە لۆمەکردن و رەخنەگرتن و بەراوردکردن بوەستیت و، هەر ئێستا هەستیت پێنووس و کاغەزێك بێنیت و شوێن ئەم ستراتیجیانە بکەویت:

١- **حاڵەتەکە:** بە دیاریکراوی ئەو دۆخە بنووسە کە بەدەستیەوە دەناڵێنیت، هەتا دەتوانیت وردبەو خۆت لە گشتاندن بەدوور بگرە.

..........................................................................

..........................................................................

٢- **بیرۆکـە:** ئـەو بیرۆکانـە بنووسـە کـە لەزەینتدایـە و بەدەسـتیانەوە دەناڵێنیت، لەمەشـدا زۆر وردبـە!.

..........................................................................................

..........................................................................................

٣- **هەستەکان:** ئەو هەستانە بنووسە کە هەستیان پێدەکەیت.

..........................................................................................

..........................................................................................

٤- **هەڵسـوکەوت:** ئـەو رەفتـارو هەڵسـوکەوتانە بنووسـە کـە بەهـۆی ئـەم ئاسـتەنگەوە پەیـڕەوت کـردووە.

..........................................................................................

..........................................................................................

٥- **ئەنجامەکان:** ئەو ئەنجامانە بنوسە کە بەهۆی ئەو هەڵسوکەوتەوە بەدەستت هێناوە.

..........................................................................................

..........................................................................................

٦- **رابـردوو:** بگەڕێـرەوە بـۆ رابـردوو بیربکەرەوە لـەوەی چیـت کـردووە، وا گەیاندویتی بـەم ئەنجامە.

..........................................................................................

..........................................................................................

٧- **پرسـیار:** لەخـۆت بپرسـە: ئایـا هـەر بەڕاسـتی دەتەوێـت چارەسـەری ئەم ئاسـتەنگە بکەیـت و سـوودی لێوەرگریـت؟

..........................................................................................

..........................................................................................

٨- هەمـوو ئەو شـتانە بنووسـە کـە پێتوایە هـەوڵ و کۆششـەکانت لەبەین دەبـەن، یاخود خێرایـی بەرەوپێشـچوونت خاوەکەنـەوە، یاخـود دەبنە هـۆی لادانت لـەو رێگایەی پیایـدا دەڕۆیـت، یاخـود دەبنە بەربەسـت لەنێوان تـۆو سـەرکەوتنی چاوەڕوانکراودا، وەك: (لاوازی شـارەزایی لەگـەڵ رکابەرەکانـدا - کەمـی کرێـارو ناسراوان).

٩- **بەرپرسیارێتی:** بەرپرسیارێتی تەواو لەئەستۆ بگرەو، ڕێگەی خۆت مەدە هەر خەریکی لۆمەو ڕەخنەگرتن بێت.

١٠-**کردار:** هەر ئێستا، نەك سبەینێ، هەستە بەگۆڕینی ئەو شتانەی پێویستە بیانگۆڕیت و، ڕێگە مەدە لوتبەرزی و خۆبەزلزانینەکانت ببنە بەربەستی بەردەم گۆڕانکاریکردن.

١١-**پابەندبوون:** لەژێر هەر بارودۆخ و ئاستەنگێکدابێت، پابەندبە بە کردارو چارەسەرەوە.

١٢-**هەڵسەنگاندن و مرونەت:** کردەوەکانت هەڵسەنگێنەو لێوەیان فێربە، ئەوەی پێویستی بە ڕێککردنەوەیە ڕێکی بکەرەوە و، مرونەتت هەبێت، بۆئەوەی ئامانجەکانت بەدی بهێنیت.

١٣-**بەتەواوی پشت بەخوا ببەستە:** سوپاس و ستاییشی بکەو هەمیشە یادی بکەرەوە، بەردەوام ئومێدت پێی هەبێت و گەشبینبە، دڵنیابە لەگەڵتدایەو، هەرکەس کاری باش بکات پاداشتی دەداتەوە.

**«ئەوە ئاستەنگە گەورەکانن مرۆڤ دروستدەکەن، ئەڵماس ئەگەر ساف و لوس نەکرێت بەردێکەو لەو ناوەدا کەوتووە و هیچ نرخ و بەهایەکی نییە»**

ئاستەنگ و چارەسەرو ئەنجامەکەشی بنووسە، بۆئەوەی وەك سەرچاوەیەك پێتبێت و، لەهەر کوێیەکی ژیانتدا ئاستەنگت تووشبوو، بۆی بگەڕێرەوە.

....................................................................................

....................................................................................

....................................................................................

....................................................................................

## پرسیاری پێنجەم: پرسیارەکانی ئاشنابوون بە ژیان

١- ئەو پێنج شتە چییە کە دەتەوێت بەوجۆرەبیت و، لەکەسێتیەوە نزیکە؟

أ- ...

ب- ...

ت- ...

پ- ...

ج- ...

٢- ئەو پێنج شتە چییە کە دەتەوێت بیانهێنیتەدی؟

أ- ...

ب- ...

ت- ...

پ- ...

ج- ...

٣- ئەو پێنج شتە چییە کە دەتەوێت هەتبێت؟

أ- ...

ب- ...

ت- ...

پ- ...

ج- ...

٤- ئەو پێنج جێگایەی جیهان کامەیە، کە دەتەوێت سەردانیان بکەیت؟

أ- ...

ب- ...

ت- ...

پ- ...

ج- ...

٥- دەتەوێت لەکوێ بژیت؟ (دیاریکراوبە: واتە وڵات یان ویلایەت یان ناوچە یان هەرێم؟ چی جۆرێك لە جۆرەکانی خانوو؟ ئەو شوێنە کامەیە کە پێتخۆشە لەنزیکیەوە نیشتەجێ بیت: ئاو؟ زەریا؟ چیا؟ خەڵك؟)

أ- ...

ب- ...

ت- ...

٦- دەتەوێت گەشتێك بکەیت، ئەو کەس یان کەسانە کێن کە حەزدەکەیت لەو گەشتەدا لەگەڵتدابن؟

.............................................................................................

.............................................................................................

## پرسیاری شەشەم: چۆن سنورێك بۆخۆم دانێم و، چۆن بوەستم؟

مەبەست لەوەی خاوەنی دەستپێشخەری بیت، ئەوەیە: لەڕووودانی شتەکاندا دەستپێشخەربیت، نەك دابنیشت و چاوەڕێ بکەیت هەتاوەکو لەخۆیەوە رووبدات.

ئەو کەسانەی لەژیانیاندا سەرکەوتوون حەزیان لەوەیە دەستپێشخەری بکەن، ئەوان بەبەردەوامی لەوە تێدەگەن ئەو بارودۆخەی تێیدا دەژین بژاردەی خۆیانە، ئەوە گرنگ نییە لەو ژیانەدا چیت بەسەردێت، بەڵکو ئەوە گرنگە چی دەکەیت لەوەی لێت روودەدات، بەهەمان شێوە، گرنگ نییە چۆن شکستت هێناوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چۆن جارێکی تر لەو شکستەت هەڵدەستیتەوە، دڵنیابە ئەو رێگایەی بەکاری دێنیت بۆ بیرکردنەوە لەخۆت و ئامانجەکانت لەگەشتن بە سەرکەوتن یارمەتیت دەدەن. هەروەها ئاشکراکردن و پەیبردن بەوەی چۆن چۆنی سنورمان لەبەردەم خۆماندا دانـاوە، هاوکارمان دەبێت لە دۆزینەوەی گومان و ترسەکانمان و، دواتریش سڕینەوەی شوێنەوارەکانی بەسەر ژیانمانەوە.

ئەم شێوازە بەکار بهێنە، بۆئەوەی زیاتر بەرچاوڕوونبیت لە هەمبەر پەیوەندی نێوان بیرکردنەوەو ئەنجامەکانت.

١- ئـەو شـتانە چيـن دەتوانيت چيـتر ئەنجاميان نەدەيـت و، كۆمەڵێـك رووداوی ئەرێنی لەژيانتـدا دروسـت بكات؟

.....................................................................................

.....................................................................................

٢- ئەو شـتانە چين دەتوانيت دەسـت بەئەنجامدانيان بكەيت و، ببێتە هۆی دروسـتبوونی كۆمەڵێك رووداوی ئەرێنی؟

.....................................................................................

.....................................................................................

٣- ئێسـتا بـە بەڵـێ يـان نەخێـر وەڵام بـدەرەوە، ئايـا تـۆ ئامادەيـت سـنورێك بۆخـۆت دابنێيـت؟

.....................................................................................

.....................................................................................

٤- لـەكام بوارانـەی ژيانـدا ئـەوەی دەتەوێـت ناتوانيـت بەدەسـتی بێنيـت؟ پەرسـتش، تەندروسـتی، پـارە، پەيوەندييـەكان.

.....................................................................................

.....................................................................................

٥- ئەو سـنوور يان پێوەر يان ئاماژانە چين (كات و شـوێن)، كە وەك بەڵگە دەيانهێنيتەوە لەسـەر شوێن و ڕێگای رۆيشـتنت بەرەو سەركەوتن؟

.....................................................................................

.....................................................................................

**تێڕوانينە تازەكەت ئاشكرا بكە، لای خۆت جێگيری بكە، نەكەی بگەڕێيتەوە بۆ تێڕوانينە كۆنەكەت.**



## پرسیاری حەوتەم: بەها تایبەتییەکانم چین؟

**بنەماو جێیابەخەکانی ژیانت چین؟**

بەشێوەیەکی سەرەکی بەها بریتیە لە: کۆمەڵێك بیرۆکەی گشتی دەربارەی ئەو ئەزمونانەی بەلای تۆوە گرنگن.

تۆ شانازی بەو ئەزمونانەوە دەکەیت کە چێژت لێ بینیون، بەپێچەوانەشەوە بەچاوی کەمەوە تەماشای ئەو ئەزمونە تاڵانە دەکەیت پیایاندا تێپەڕیویت.

جا بەهۆی ئەوەی کۆمەڵێك ڕوداو هەن بەشێوەیەك لە شێوەکان بەلای تۆوە گرنگیان هەیە، دەبینیت خاوەنی کۆمەڵێك بەهای جیاوازیت، جاری وا هەیە بەچەند ڕێگایەکی جیاواز شانازی بە ڕووداوێکەوە دەکەیت، هەندێك جاریش یەك شێواز پەیڕەو دەکەیت لە شانازیکردن بە کۆمەڵێك ئەزمونی جیاوازەوە، ژمارەیەکی زۆری ئەو بڕیارانەی لەژیاندا دەیاندەین، لە هەڵبژاردنی ژەمێك خۆراك یان کڕینی ئۆتۆمبیلێك قورسترن.

بۆئەوەی بزانین کام لەو بڕیارانە لەوانی تر باشترن و، کامەیان بۆ ئێمە گرنگترە ئەوەیان هەڵبژێرین، زۆر گرنگە بەهاکانمان لەشێوەی پلیکانەیەك لە گرنگترین بەهاوە بۆ ئەو بەهایانەی گرنگیان کەمترە ڕیز بکەین، کاتێك کەسێك ناتوانێت هەستێت بە ڕیزکردنی بەهاکانی بەپێی گرنگی و لەپێشتربوونیان، ئەوە لەوانەیە ئەوکەسە لەکاتی بڕیارداندا بەهیچ جۆرێك بیر لەبەهاکانی تریشی نەکاتەوە.

هەمـووان ڕووبـەڕووی ئـەو ململانێیەی نێـوان بەهاکانمـان دەبینەوە، تەنانـەت ئەگەر زۆربەشـیان بەرهەمـی ئەزمونـە تایبەتیـەکانی خۆمـان بێت، ئەمـە هـەر ڕوودەدات. بەڵام پێویسـتە بزانـین کـە سـەرچاوەگرتنی بەهاکانمـان لـە ئەزموونـی تایبەتی خۆمانـەوە نابێتە ڕێگـر لەبـەردەم ئـەوەی ژمارەیەکـی زۆری بەهاکانمـان لـە باووباپیـران و کەسـانی ترەوە وەرگریـن، بەبـێ ئـەوەی ئەزمونێکی وامـان هەبێـت بیکەینـە بنەمـای وەرگرتنـی ئـەو بەهایانـە. بۆنموونـە: منـاڵ لـەکاتی پەڕینـەوە لەشـەقامەکاندا دەتوانێـت فێـری بەهـای «وریابوون»بێـت، بۆئـەوەی ئۆتۆمبیـل لێـی نـەدات، بەبـێ ئـەوەی پێویسـتی بەهەبوونی ئەزمـون بێـت بۆئـەوەی بزانێـت ئـەو بەهایـە وەربگرێـت یـان وەری نەگرێـت. هەندێك جاریـش سـەرەڕای ئەوەی بەهـاکانی کۆمەڵگا بەسـوودن بۆمـان، بـەڵام وەری ناگرین و لەگەڵیـان دەکەوینـە ململانێوە.

## بەها هێزێکی پاڵنەری دیدگایە

وێـڕای ململانێـمان لەگـەڵ ئـەو بەهایانـەی لەکۆمەڵگەکەمانـدا هـەن، بـەڵام ئەگەری هەیە بەشـێکی زۆریـان وەرگرین و پەیـڕەوی لێبکەیـن، لەبەرئەوەی بەشـێکی قبوڵکراوی ئـەو کلتـورو ڕۆشـنبیریەمانە کـە تیایـدا گەورەبویین، یـا لەگەڵیشـماندا نەگونجێت.

بەوپێیـەی هەمـوو کۆمەڵگەیـەك خـاوەنی بەهـای تایبـەت بەخۆیـەتی و، جیـاوازە لەو بەهایانـەی کۆمەڵگـەکانی تر هەیانـە، ئەمـەش دەمانەگەیەنێتە ئەو ئەنجامـەی کە زۆربەی جـار ڕۆشـنبیری و کلتـورەکان لەگـەڵ یەکـتردا ناگونجێن، هەندێکیشـیان لەگـەڵ هەموو کەسـێکدا دەگونجێن.

کاتێـك کەسـێك بەهایـەکی کۆمەڵایـەتی پەسـەند دەکات و لەگەڵیـدا ناگونجێـت، ئەمـە وادەکات لەگـەڵ ئـەو بەهایەدا بکەوێتـە ململانێوە، بۆیـە بەناچـاری کۆنترۆڵکردنی کاردانـەوەکانی دەکات، بگـرە لەوانەیـە کاردانـەوەکانی پشـتگوێی بخات یـان نکوڵی لێ بکات.

## بەها تایبەتیەکانمان بەهێزترین پاڵنەرن بۆ گۆڕانکاری و بەدیهێنانی سەرکەوتن



# جۆرەکانی بەها

بەها بریتیە لە: شتێکی جێگیر لە نەستماندا، کە خۆمان سەپاندوومانە بەسەر خۆماندا، یاخود لەدەرەوەی خۆمانەوە سەپێنراوە بەسەرماندا و، لە نەستماندا جێگیربووە.

ئـەم بەهایانـە کۆمەڵـە پێوەرێـکی جێگیـرن و بەئاگایـی بێـت یـان بێئاگایـی هـەوڵ بـۆ تێرکردنیـان دەدەیـن، ئـەم بەهایانە سـەرچاوەی خـۆراکی دیدگامانـن و، وزەو چالاکیمان پێدەبەخشـن، هـەر ئەمانیـش لەپشـت رەفتـارو هەڵسـوکەوتەکانمانەوەن.

سـەنتەری بەهـاکان هەسـتەکانن، لەبەرئـەوەی بەهاکانمـان پەیوەسـتن بـە هەسـت و سـۆزەکانەوە، لەکاتێکـدا بیروباوەڕەکانمـان پەیوەسـتن بـە ژیـری و لۆجیکـەوە، ئـەوەی پاڵـمان دەنێـت بـەرەو ئەنجامـدانی کـردەوە یاخـود وازهێنـان لەکردەیـەك بەهاکانن، هەر بەهاکانیشـن وامـان لێدەکـەن دیدگاکەمـان بپارێزیـن و بۆی بژیـن، وە هۆکارمـان دەداتێ بۆئـەوەی لەپێنـاوی گەشـتن بـە ئامانجەکانمانـدا قوربـانی بدەین.

## چەند تایبەتمەندییەکی بەهاکان:

**١- بەهای هۆکارەکان و بەهای مەبەستەکان (قيم وسائل وقيم غايات)**

بەو مانایەی بەهای هۆکار (قيم وسيلە) دەمگەیەنێت بە بەهای مەبەست (قيم غايە)

نمونه: بەهای سەرکەوتن دەمگەیەنێت بەبەهای دەستکەوت یان پارە.

بەهای دەستکەوت دەمگەیەنێت بەبەهای بەختەوەری

بەهای پارە دەمگەیەنێت بەبەهای بەختەوەری.

**٢- بەهای نزیککردنەوە و بەهای دوورخستنەوە**

بەو مانایەی هەندێك بەها هەن نزیکم دەکەنەوە و رامدەکێشن بەرەو کردار و، هەندێك بەهاش هەن دوورم دەخەنەوە لە هەستان بەئەنجامدانی کردار.

نمونە: ئەو بەهای سەرکەوتنەی دەمەوێت بیهێنمەدی وام لێدەکات هەندێك دوورکەومەوە لە پشوودان، کەواتە بەهای پشوودانم لاواز دەبێت، لەبەرئەوەی دەستکەوت و سەرکەوتنێك چاوەڕێم دەکات کە لە پشوودان گرنگترە.

**٣- زۆربەی بەهاکان لەژێر ئەمجۆرەی بەهادا پۆلێن دەکرێن:**

**أ- دەستکەوت (شکست):** سەرکەوتن، داهێنان، پلاندانان، پەرەپێدان، ...

**ب- هێز (لاوازی):** جیاوازبوون، ئاڵنگاری، غیرەکردن، شانازی، پیادا هەڵدان، سەرکەوتن، ...

**ت- پەیوەندییەکان (داخراو):** متمانە، خۆشەویستی، ڕێزگرتن، پیادا هەڵدان، پێزانین، هاوکاری، ...

## چۆن بەهاکان دەربێنم؟

١- بۆ ئاشکراکردنی بەهایەك، دەپرسین: سەبارەت بە .... چی شتێك بۆتۆ گرنگە؟

٢- گرنگترین ئەو بنەمایانە چین ژیانی خۆتت لەسەر بونیاد ناون؟

٣- گرنگترین شت بەلای تۆوە چییە لە (خێزان، کار، ...)؟

٤- بوون بەخاوەنی ئەم بەهایە یان لەدەستدانی بەلای تۆوە چی دەگەیەنێت؟

٥- بەمجۆرە بەردەوام دەبیت، هەتاوەکو لیستێك بەهەموو بەهاکان دەنوسیت، پاشان سەرلەنوێ بەگوێرەی گرنگیان لیستەکە بنووسەرەوە، لەکاتی دەرهێنانی بەهاکاندا پێویستە رەچاوی ئەم شتانە بکرێت:

أ- لەهەستەکانتەوە رێنمایی وەربگرە.

ب-دڵنیابە لەوەی رۆژانە بەکرداریی ئەو بەهایە ئەنجام دەدەیت.

ت-دوای دەرهێنانی ئەو بەهایەی پەیوەستە بە رەفتارێکی رۆژانەتەوە، ئینجا ئەو بەهایانەشی بۆ بێنە کە هەست دەکەیت بۆ پشتیوانیکردنی ئەم بەهایە گرنگن.

## بۆ دڵنیابوون لە دروستی بەهاکە و، دڵنیابوون لەوەی جێبەجێ دەکرێت، بپرسە:

١- **بەهاکە چییە؟** بۆنمونە: تەندروستی.

٢- **بۆچی حەزت بەم بەهایە هەیەو گونجاوە بەلاتەوە:** لەبەر ئەوەی بۆ بەدیهێنانی دەستکەوت و مانەوە پێویستم بە هێز هەیە.

٣- **ئەو رەفتارانە چین کە بەهۆی پابەندبوون بەم بەهایەوە پێویستە ئەنجام بدرێن:** لەبەرئەوەی بایەخ بەتەندروستیم دەدەم و وەرزش دەکەم.

٤- **ئەو بارودۆخە کامەیە کە پەیوەستە بەم بەهایەوە:** ئامادەباشبم بۆ ئاڵنگارییەکانی داهاتوو.

٥- **مەبەستی ئەرێنی لەم بەهایەدا چییە:** لەبەرئەوەی من چێژ لەژیانم دەبینم و، بۆ کەسانی تر نمونەو پێشەنگم.

٦- **ئاڵنگارییەکانی بەردەم ئەم بەهایە چین:** ئەرك و بەرپرسیارێتیم لەئەستۆدایەو دەبێت ئەنجامیان بدەم.

٧- **کۆت و ئەنجامەکانی ئەم بەهایە کامانەن:**

- وام لێدەکات پارە خەرج بکەم، بۆئەوەی ئەو بەهایە بەدەستبێنم و پارێزگاری لێبکەم .
- نایەڵێت خۆم شەکەت و ماندوو بکەم.

ئێمە بەهاکان نابینین، بەڵام ئەو رەفتارانە دەبینین کە لەبەهاکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر بوونی بەها یان نەبوونی.

## ئێستاش بەهاکانت دەربهێنە و، ڕیزیان بکە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | | ٦ | |
| ٢ | | ٧ | |
| ٣ | | ٨ | |
| ٤ | | ٩ | |
| ٥ | | ١٠ | |



## ڕیزکردنی بەهاکان بەشێوەی پلیکانەیی

دوای ئـــەوەی هەســـتایت بەکۆکردنـــەوەی بەهاکانـــت، بەگوێـــرەی گرنگیی و لەپێشـــتربوونیان، دەتوانیت بەدوو ڕێگا و لەسەر شـــێوەی پلیکانەیی ریزیان بکەیت:

## ڕێگای یەکەم:

١- **لەخـۆت بپرسـە:** ئایـا بەهـای (١) گرنگـترە یـان بەهـای (٢)، بەمجـۆرە هەتاوەکـو کۆتایـی لیسـتی بەهـاکان بەردەوامبە، پاشـان دووبارەو بەگوێـرەی ریزبەندییـە تازەکە لیسـتەکە بنووسـەرەوە.

٢- **دوای ئـەوە بپرسـە:** بـۆ لەدەسـتدانی کامیـان زیاتـر ئـازار دەچێژیـت، بەهـای (١) یـان بەهـای (٢)، بەمجـۆرە هەتاوەکـو کۆتایـی لیسـتی بەهـاکان بەردەوامبە، پاشـان دووبـارەو بەگوێـرەی ریزبەندییـە تازەکـە لیسـتەکە بنووسـەرەوە.

٣- **لـەم قۆناغـەدا لەخـۆت بپرسـە:** ئایا لەبـوونی بەهای ژمـارە (٢)دا دەتوانـم پێچەوانەی بەهـای ژمـارە (١) هەڵسـوکەوت بکـەم؟ بەمجـۆرە بەردەوامبـە هەتاوەکـو هەمـوو بەهـاکان ڕیزدەکەیـت.

**تێبینـی:** دەکرێـت بەهـاکان هەمـان ئاسـتی گرنگییـان هەبێـت، لەوانەشـە ریزبەنـدی بەهـاکان بەگوێـرەی کات و شـوێن و ڕادەی پێگەشـتوویی مرۆڤەکـە جیاوازبـن.

## ڕێگای دووەم:

بەهاكان بەشێوەی ئاسۆیی و ستوونیش بخەرە خشتەیەكەوە، پاشان لە ستونەكەدا یەك نمرە دادەنێین بۆ ئەو بەهایەی گرنگترە، سفریش لەو خانە ئاسۆییەدا دادەنێین كە گرنگی كەمترە.

- بۆنمونە دەپرسین: ئایا ڕاستگۆیی گرنگترە یان تەندروستی؟ واتە كامیان گرنگترە، ئەوەی كە ڕاستگۆو نەخۆش بژیم، یان تەندروست و بێزراو بژیم؟
- كام ستونە زۆرترین نمرەی كۆكردەوە ئەوەیان گرنگترەو، بەپێچەوانەشەوە.
- كام خانە ئاسۆییانە زۆرترین نمرەی كۆكردەوە ئەوەیان گرنگی كەمترەو، بەپێچەوانەشەوە.
- ئەگەر دوو ستون یەكسان بوون، ئەوە كامیان لەوی تریان گرنگتربوو ئەوەیان هەڵدەبژێرم، بۆ ئەمەش ئەو شێوازە بەكاردێنم كە لە ڕێگای یەكەمدا باسمان كرد.
- ئەگەر چەند ستونێك یەكسان بوون، ئەوكات بەوشێوازەی لەڕێگای یەكەمدا باسمان كرد یەكلای دەكەمەوە.
- هەمان پرۆسە لە بوارەكانی دیكەی بەهاكانتدا دووبارە بكەرەوە، بۆنمونە: خێزان، كار، پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكان، ...

## نمونەیەكی ڕیزكردنی بەهاكان:

| بەها | ١- ڕاستگۆیی | ٢- تەندروستی | ٣- پارە | ٤- ڕێز |
|---|---|---|---|---|
| ڕاستگۆیی | + | ٠ | ٠ | ٠ |
| تەندروستی | ١ | + | ٠ | ٠ |
| پارە | ١ | ١ | + | ١ |
| ڕێز | ١ | ١ | ٠ | + |
| نمرە | ٣ | ٢ | ٠ | ١ |

- لەوكاتەی پەیامەكەت دادەڕێژیت و، پلانەكەت دادەنێیت، هەوڵ بدە ئەم بەهاو بنەمایانەت لەبیربێت.

## بەهای باڵای خۆت بدۆزەرەوە

هـــەر مرۆڤێـــك كۆمەڵێك ســـەرچاوەی هەیـــە بتوانێـــت بەهۆیانـــەوە لەژیاندا ســـەركەوتووبێت، ئـــەو بوارانەش بریتیـــن لە و خاڵـــی بەهێـــزو تایبەتمەندییانەی لەكەســـانی دیكە جیای دەكەنـــەوە، بۆنمونە: لەوانەیە كەســـێكی لێهاتووبێت لەبواری رێكخســـتن و پلاندانانـــدا، لەوانەیە لـــە دۆزینـــەوەی بیرۆكەی داهێنەرانـــەی تازە، یـــان بەڕێوەبردنی ســـەرچاوە داراییـــەكان، یان چارەســـەركردنی كێشـــە ئاڵۆزەكاندا بەهرەمەندبیت، بناغەی ســـەركەوتن ئەوەیە تەركیز بخەیتە ســـەر ئـــەو تایبەتمەندییە جیاكەرەوانـــەی هەتە، چونكـــە ئەوەی تـــۆ هەتە ئەوانی تـــر نیانە.

- دیارترین خاڵە جیاكەرەوە بێوێنەكانت كامانەن؟
- بەبۆچوونی تۆ ئەو بەها راستەقینەیە كامەیە كە لە ژیانی تایبەتی تۆدا رەنگی داوەتەوە؟
- بەبۆچوونی تۆ ئەو بەها راستەقینەیە كامەیە كە لە ژیانی پیشەییتدا رەنگی داوەتەوە؟
- ئـەو رۆڵ و چالاكیانـەی ئێسـتا ئەنجامیـان دەدەیت تا چ رادەیـەك پەیوەندییـان بە بەها تایبەتیەكەتـەوە هەیە؟

بـۆ ئـەوەی توانـا بێوێنەكانت زیـاد بكەیت، ئـەو گۆڕانكاریيانـە كامانەن كـە ئامادەیت تیادایـە ئەنجامیـان بدەیـت، بۆئـەوەی بەهایـەكی بۆ زیـاد بكەیت یان بەهێـزی بكەیت؟

..........................................................................................

..........................................................................................

هـەر كـە زانیـت بەهـا بێوێنەكـەی ژیـانی تایبـەتی و پیشـەییت كامەیە، لەخۆت بپرسـە بـڕی ئـەو كاتـە چەنـدە كـە لەژیـانی رۆژانەتـدا تەرخـانی دەكەیـت بـۆ ئەنجامـدانی ئەو چالاكیانـەی تیایانـدا جیاوازیـت؟

باشـترین وەڵام ئەوەیـە كـە: دەمەوێـت ٨٠٪ی كاتەكانـت تەركیـز بخەیتـە سـەر ئـەو شـتانەی تیایـدا سـەركەوتویت، ئایـا دەتوانیـت ئەمـە بكەیـت؟

**تكام وایە لەژیانتدا سوود لەهەموو ئەو بەهرەو نیعمەتانە وەرگریت كە خوای گەورە پێی بەخشیویت.**

## پرسیاری هەشتەم: لە ژیانتدا کێ پێشەنگ یان نمونەی باڵای تۆیە؟

ئێمە هەمیشە سەرقاڵی راکردنین بەدوای خەونەکانمان و، دروستکردنی چارەنوسمان، تەنانەت هەندێك جار ئەو کەسانەمان بیردەچێتەوە کە بەدەورمانەوەن و، یارمەتیان داوین لە هێنانەدی ئەو خەونانەدا، بۆیە هیوادارم ئەو کەسە گرنگانەی ژیانت بیرنەچێتەوە (خێزان و هاوڕێ نزیکەکانت).

١- ئەو سیفاتانە چین لەکەسانی تردا هەن و زۆر پێیان سەرسامم؟

..........................................................................................

..........................................................................................

٢- ئەو کەسانە کێن پێیان سەرسامم؟

أ- کەسایەتی مێژوویی:

- ......
- ......
- ......

- لەبەرچی پێیان سەرسامم؟

- ....
- ....
- ....

ب- کەسایەتیە هاوچەرخەکان

- ....
- ....
- ....

- لەبەرچی پێیان سەرسامم؟

- ...
- ...
- ...

- ئەو کەسانەی تۆ پێیان سەرسامیت ئیشیان چییە؟

- ...
- ...
- ...

٣- ئەوکەسە کێیە کە زۆرترین کاریگەری هەبووە لەسەر ژیانت؟

..........................................................................

..........................................................................

٤- بۆچی ئەوکەسە ئەو کاریگەرییە گەورەیەی هەیە لەسەر ژیانت؟

..........................................................................

..........................................................................

٥- ئایا دەکرێت تۆ ببیتە پێشەنگی کەسێك، یان یارمەتی خەڵك بدەیت؟

..........................................................................

..........................................................................

٦- کاتێك قسە یان وێنەی ئەو کەسە پێشەنگەی هاندەرت بووە بۆ کارکردن، لەبەردەمتدا دادەنێیت، پێم بڵێ پێشەنگەکەت خاوەنی کام لەم سیفەتانەیە: پەرستن، رەفتار، وێنە، دیاری، ...

..........................................................................

..........................................................................

**هەموو ئەو کەسانەی کارو ئامانجەکانی خۆیان خۆشدەوێت، تۆشیان خۆشدەوێت، کەسانی دڵکار(جدی) کەسانی وەك خۆیان خۆشدەوێت، لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەوجۆرە کەسانەدا دەتوانن ئامانجەکانیان بهێننەدی، بۆیە خۆشویستنی کەسانی دڵکارو هەبوونی پەیوەندی بەردەوام لەگەڵیان دەتکاتە کەسێکی جیاواز.**



## پرسـیاری نۆیـەم: چـۆن پیشـەی گونجـاوی خـۆت هەڵدەبژێریـت؟

ئەگـەر ویسـتت ئۆتۆمبیـل یـان خانـوو یاخود یاخـود تەنانـەت جلوبەرگێـك بكڕیت، ئـەوە بـەلانی کەمـەوە چەنـد ڕۆژو هەفتەیـەك دەگەڕێیت، هەتاوەکـو ئەو شـتە دەدۆزیتەوە کـە لەگـەڵ حـەزو گیرفانتـدا دەگونجێـت، ئێسـتا پێـم بڵـێ: ئایـا پێـت وانیـە ژیـان و داهاتـووت لـەو کەلوپەلانـە گرنگتربـن؟!!

ئـەرێ خـۆت گرنگـترو بەبایەخـتر نیت؟ ئـەرێ پیشـەی داهاتـووت گەورەتـر نییە لەو کەلوپەلانـە و، شـایانی ئـەوە نیـە چەنـد کاتژمێـر یـان چەنـد ڕۆژێـکی ژیانـت تەرخـان بکەیـت، بۆئـەوەی پلان بـۆ دۆزینـەوەی پیشـەیەکی گونجاو دابنێیـت کە بەهۆیـەوە ببیتە کەسـێکی جیـاوازو، بـۆ هەمـوو ژیانـت بەختـەوەر بیت؟

**١- ئەو پیشە یان ئیشانە کامانەن ئارەزووت لێیە ئەنجامیان بدەیت؟**

أ- ................. ب- ....................... ت- ......................

**٢- بەبۆچوونی کەسانی دەوروبەرت، ئەو پیشە یان ئیشانە کامانەن کە بۆتۆ گونجاون؟**

أ- ................. ب- ...................... ت- .............

**٣- ئەو پیشانە کامانەن دەرفەتێکی گەورەت هەیە بۆ ئەوەی هەڵیان بژێریت؟**

أ- ............... ب- ................... ت- ......................

**٤- ئەو پیشانە کامانەن دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت؟**

أ- ...................... ب- .................... ت- .....................

**٥- ئەو پیشانە کامانەن حەزت لێیانە و دەتوانیت لەڕێگایانەوە دەستکەوتت هەبێت؟**

أ- ................ ب- ................... ت- ......................

## بەگوێرەی گرنگی و لەپێشتربوونیان پیشەکان ریزبکە، پاشان لەبەردەمیدا رێژەکان دابنێ:

| ئەو پیشەیەی ئارەزووم لێیەتی | بەبۆچوونی خۆم گونجاوە بۆم | بەبۆچوونی کەسانی تر گونجاوە بۆم | دەرفەتی کارپێکردنیم هەیە | بەهۆیەوە دەتوانم دەستکەوتم هەبێت | کۆی ئەنجامەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ |
| | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ |
| | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ |
| | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ | ٪ |

پیشەکانی پێشوو لەسەر بنەمای بەرزترین نمرە ڕیزبکە، پاشان پیشەی یەکەم بێنەو وەك لەو خشتەیەی خوارەوەدا روون کراوەتەوە، لایەنی ئەرێنی و نەرێنیەکەی دیاری بکە، پاشان پیشەی دووەم و بەوجۆرە هەتا هەموو پیشەکان تەواو دەکەیت:

**پیشەی ژمارە (١):** ..............................

| ئەرێنی | نەرێنی |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |

**پیشەی ژمارە (٢): ..............................**

| نەرێنی | ئەرێنی |
|---|---|
| | |
| | |
| | |
| | |

ئـەو ئەنجامانەی لەپیشـەکانی پێشـوەوە دەسـتت دەکەوێت بیاننووسـە، لەسـەر بنەمای گونجاوتریـن (لایـەنی ئەرێنـی و نەرێنـی)، پاشـان بەگرنگترینیان دەسـت پێبکە، پاشـان گرنگـتر و، ئـەو ئەنجامانـەی بەسـەردا جێبەجـێ بکە کە لەسـەرەوە دەسـتت کەوتووە.

**پیشەی ژمارە (١): ..............................**

| ئەنجامە دوورەکان | ئەنجامە مامناوەندەکان | ئەنجامە نزیکەکان |
|---|---|---|
| | | |
| | | |
| | | |

**پیشەی ژمارە (٢): ..............................**

| ئەنجامە دوورەکان | ئەنجامە مامناوەندەکان | ئەنجامە نزیکەکان |
|---|---|---|
| | | |
| | | |
| | | |

**گونجاوتریـن پیشـە کامەیـە بـەراورد بـە پیشـەکانی تـر باشـترین ئەنجامـت لێیـەوە دەسـتدەکەوێت؟**

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

## پرسیاری دەیەم: ئەو ڕۆڵانە کامانەن لەژیانمدا ئەنجامیان دەدەم؟

لیستێك بنووسە بەتەواوی ئەو ڕۆڵانەی ئێستا ئەنجامیان دەدەیت، یاخود ساڵی داهاتوو ئەنجامیان دەدەیت: (ڕۆڵت وەك خوێندكار، كوڕ، مێرد، باوك، كارمەند، هاوڕێ، نووسەر، ....).

**ئایا ئەم ڕۆڵانە گونجاون لەگەڵ ئەوەی ئارەزووت لێیەو دەتەوێت؟**

خەڵكێكی زۆر دەكەونە بۆسەی بازنەیەكی ناهاوسەنگەوە، بەوەی تەركیز دەخەنە سەر هەندێك لایەنی ژیان و هەندێك لایەنی دیكەی گرنگ فەرامۆش دەكەن (پیشەیی، كۆمەڵایەتی، ڕۆحی، ...)، لەژیانی مرۆڤیشدا سێ تەوەرەی سەرەكی هەیە (هێز، كاریگەری، پاڵپشتی)، پێنج لایەنی گرنگیش هەن یەكەمجار پێویستە بەهێزبن و پاشان كاریگەربن (كەسی، زانستی، پیشەیی، مادی، كۆمەڵایەتی) دوای ئەمانە ئینجا لایەنەكانی تر دێن:

| تەوەری هێز | تەوەری كاریگەری | تەوەری پاڵپشتی |
|---|---|---|
| ١- لایەنی كەسی | ٤- لایەنی دارایی | ٧- لایەنی تەندروستی |
| ٢- لایەنی زانستی | ٥- لایەنی كۆمەڵایەتی | ٨- لایەنی خۆبەخشی |
| ٣- لایەنی پیشەیی | ٦- لایەنی ڕۆحانی | ٩- لایەنی .... |

نمونە: ویلێكی پاسكیل بهێنە پێشچاوی خۆت، كە چەند تاڵە تەلێكی درێژی جۆراوجۆری هەیە، هاوسەنگیەكەی چۆن دەبێت؟!



## راهێنان: ئێستا ویلی ژیانی تایبەتی خۆت دروست بکە:

أ- لەسـەر بنەمـای بوارە جیـاوازەکانی ژیان ویلـی تایبەت بەخۆت دروسـت بکە، هەوڵ بـدە بـوارەکان (٩) بوار یـان کەمتربن:

| تەوەری هێز | تەوەری کاریگەری | تەوەری پاڵپشتی |
|---|---|---|
| ١- | ٤- | ٧- |
| ٢- | ٥- | ٨- |
| ٣- | ٦- | ٩- |

ب- نمـرەی رازیبوونـت لەهـەر تولێـکی ویلەکـە بنووسـە، بەجۆرێـك (سـفر) چەقـی ویلەکـە (ناڕازیبـوون)ەو، (١٠) کۆتایی توڵەکـە (رازیبوونی تـەواو)ە، هەر نمرەیەکی تـر کـە لەنێـوان (سـفر - ١٠) دایدەنێـت، دەبێـت بـەو نمرەیـەی تـۆ لەو بـوارەدا بۆ خـۆتی دادەنێت.

ت- ئـەو خاڵانـە بگەیەنە بەیەك کە لەسـەر توڵەکان بـۆ بوارە جیاوازەکان داتنـاوە و، ئینجا تەماشـایەکی بکە بزانە ئـەو وێنەیەی بـۆت دەرچووە بازنەییە یـان لاروولەوێرە؟!




پ- ئەگـەر ویلەکـە لاروولەوێربـوو لەخـۆت بپرسـە: ئایـا ویلێـکی لەمشـێوەیە دەتوانێـت بـڕوات بەڕێـوەو خـول بخـوات، یاخـود ویلەکـە دەبێـت بازنەیـی بێـت؟

ج- ئێستا بزانە تاچ رادەیەك لە ویلی ژیانت رازیت و، تاچ رادەیەکیش هەستەکەیت کەمتەرخەمیت.

ح- ئەو بوارانە دیاری بکە کە ویلی ژیانتیان خوارکردووە، پاشان هەموو ماوە نا ماوەیەك ئەم راهێنانە دووبارە بکەرەوە (بۆنمونە مانگی جارێك).

## تەرکیز بخەمە سەر کام بواری ژیانم؟

پێویستە ئاگاداری ئەوەبیت کە ئەم بوارانە لەخزمەتی ئامانجەکانتدان، هەوڵ بدە ئەو رۆڵە دیاری بکەیت دەتەوێتساڵی داهاتوو تەرکیزی بخەیتەسەرو بایەخی پێبدەیت، بیرت نەچێت بەگوێرەی گرنگی و لەپێشتربوونیان رۆڵەکانی تریش ریزبکەیت، هەتا ئەورۆڵانەی لەسەرەتاوە داتناون گونجاوتربن لەگەڵ ئامانجەکانتدا، ئەو رێگایەی گرتووتە راستتر و دروستترە.

## فەرموو تۆو ئەم چیرۆکە:

عومەر تەمەنی بوو بە ٢٥ ساڵ، بڕیاریدا چیتر تەمەنی لەشتی بێسوددا بەفیرۆ نەدات و، هەر کەمتەرخەمییەك لەژیانیدا هەبێت چاکی بکاتەوە، بۆیە دەستی کرد بە ئیشی نوێنەری فرۆشتنی کەرەستەی جوانکاری، هەرچەندە کاتژمێرەکانی کارکردن دیاری نەکرابوون، بەلام ئەم لەسەر خۆیی پێویست کردبوو رۆژانە (١٦) کاتژمێر کاربکات، هەشت کاتژمێریشی دانابوو بۆ پشوودان، کە بەبۆچوونی خۆی ئەو ماوەیە بەسبوو بۆ پشوودان، لەبەرئەوەی پێی وابوو پێویستە ئیشی زیاتر بکات، هەرواشبوو بەراورد بەهاورێکانی توانی قازانجێکی زۆر بکات، وردە وردە لەکۆمپانیا پلەکەی بەرزتر دەبوویەوەو وای لێهات پۆستی کارگێری دەبرد بەڕێوە، بەلام دوای نزیکەی دوومانگ هەستی بە شەکەتی و ماندوویی دەکرد، دوای ئەوەی سەردانی پزیشکی کرد، بۆی دەرکەوت ئەو شەکەت و ماندویەتیە هی کەمی پشوودان و حەوانەوەیە، بۆیە پزیشکەکە پێی وت پێویستە رۆژانە لانی کەم ١٢ کاتژمێر تەرخان بکەیت بۆ پشوودان و حەوانەوە، هەرواشبوو محمد بەگوێی پزیشکەکەی کردو، ژمارەی کاتژمێرەکانی حەوانەوەو پشوودانی زیاترکرد و، بەوهۆیەشەوە جەستەی تین و هێزەکەی جارانی بۆ گەڕایەوە، بەلام محمد هەستی کرد ئەو جۆش وخرۆشەی سەرەتای بۆ ئیشەکەی نەماوە، بگرە بەپێچەوانەوە وای لێهات زۆر بەلایەوە قورسبوو بچێت بۆسەر کارەکەی، رۆژ لەدوای رۆژ ئەم هەستە زیاترو بەهێزتر دەبوو.

رۆژێکیان خەریکی ئیشکردن بوو، هاورێیەکی سەردەمانی خوێندنی هات بۆلای،

محمد زۆر دڵخۆشبوو بە بینینی ئەم هاوڕێیەی، هەستی بە خۆشیەکی زۆرکرد لەدەرونیدا و، کاتێك قسەی بۆ هاوڕێکەی دەکرد وای دەزانی خەریکی ژەنینی مۆسیقایە، پاش کەمێك هاوڕێکەی مۆڵەتی خواست و ڕۆیشت، بەڵام بیرکردنەوەی محمد هێشتا لای ئەو هەستەبوو کە بەبینینی هاوڕێکەی بۆی دروستبوو، لێرەوە محمد بۆی دەرکەوت بەتەنها سەرکەوتنی لەکارەکەیدا بەس نییە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کەسێکی سەرکەوتووە، بەڵکو پێویستە لەبواری کۆمەڵایەتی و جەستەیی و خێزانیشدا سەرکەوتووبێت، لەبەرئەوەی کەسی سەرکەوتوو بۆ بوارێك واز لەبوارێکی تر ناهێنێت، پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی: «جەستەت مافی بەسەرتەوە هەیە، ماڵ ومنداڵ و کەسوکارت مافیان بەسەرتەوە هەیە، پەروەردگاریشت مافی بەسەرتەوە هەیە، بۆیە هەر خاوەن مافەو مافی خۆیی بدەرێ».

لێرەدا قۆناغی دەستنیشانکردن کۆتایی دێت، کە تایبەتبوو بە لەنزیك و راستگۆیانە ناسینی خۆت، ئەمەش بەیەکێك لە قۆناغە گرنگەکانی دانانی پلانێکی دروست دادەنرێت.

**تێبینی:** وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی پێشوو بەشێوەیەکی راست و دڵکارانە، زۆر هاوکارت دەبێت لە دانانی پلانێکی دروست.

- ئەو پرسیارەی لێرەدا دێتە پێشەوە ئەوەیە: ئایا پێویستە ئەوکارە بکەم کە خۆشم دەوێت و حەزم لێیەتی؟
- یاخود ئەو کارە بکەم کە دەتوانم ئەنجامی بدەم و لەگەڵ تواناکانمدا دەگونجێت؟

## بۆچوونت چییە؟

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

..........................................................................

**وەڵام:** گرنگ نییە ئەوکارە بکەیت کە ئارەزووت لێیەتی، بەڵام گرنگە ئەوکارەی دەیکەیت ئارەزووت لێی بێت. پەندێکی ئینگلیزی



# بەکرداری بەڕێوەبردنی خود

کاتێـك خەریکـی کارکردنی لە پیشـەیەکی دیاریکـراودا، لەوانەیە بتەوێـت بۆ ماوەیەکی کـورت بوەسـتیت و بیربکەیتـەوە، مـن بەتـەواوی هانـت دەدەم ئـەم کارە بکەیـت، لەبەرئـەوەی هەندێـك جـار، لـەو ڕێگایـەوە تێڕوانیـن و وەڵامـی ڕاسـتەقینەی گرنگترین پرسـیارەکانی ژیانمـان دەسـتدەکەوێت.

بۆئـەوەی ئەمـە بکەیـت، پێشـنیارت بۆدەکـەم بەتەنهـا و لـە کونجێکی چـۆڵ و ئارامی ماڵەوەتاندا دابنیشـیت، لە شـوێنێکدا هەسـت بەئاسـودەیی بکەیت، ئەو مۆسـیقایە لێبدە کـە زۆر حـەزت لێیـە، مۆمێـك داگیرسـێنە و، تەماشـای دیمەنێـك بکـە کـە زۆر دڵگیـرە بەلاتـەوە، هەرچـی پێویسـتە بیکە بۆئـەوەی بگەیت بە بیرۆکـەی تەواو، ئەگەر پێت باشـە لـە قاوەخانەیـەکی نزیـك خۆتـان دانیشـیت دانیشـە، ئەگـەر پێـت خۆشـە بەنـاو یەکێك لـە پارکەکانـدا پیاسـە بکەیـت بیکـە، ڕەنگـە ببێتـە هـۆی فراوانکـردنی ئاسـۆی بیـرت و، هاوکاریـت بـکات لە دەسـتکەوتنی وەڵامـی ئـەو پرسـیارانەی بەدوایانـدا دەگەڕێیت.

لەبیـرت بێـت ئـەم وەڵامانـە لەناخـی خۆتدایـە، بۆیـە هەتاوەکـو زیاتـر هەسـت بـە ئاسـودەیی و گونجاویـی بکەیـت لەگـەڵ ژینگەکەتـدا، بـۆت دەردەکەوێـت توانـای

تێگەشتنت لەخۆت ئاسانتر دەبێت و، کرانەوەت بەسەر خۆتدا ئاسانترەو، ئاسانتریش وەڵامەکان بەکێشدەکەیت بۆلای خۆت.

هەموومان خاوەن بەهرەی تایبەت بەخۆمانین، هەتاوەکو زیاتر بەکاریان بهێنین، ژیانمان باشتر دەبێت، هەروەها ژیانی کەسانی دەوروبەریشمان زۆر باشتر دەبێت، بەلام زۆربەی جار ئێمە هەر خەریکی بەکەم تەماشاکردنی خۆمانین و، ئەو شتانەمان بیردەچێتەوە کە لەکەسانی تر جیامان دەکاتەوە، ئەگەر داوات لێبکەم هەستیت بە دانانی لیستێك بە خاڵە بەهێزەکانت و، ئەو شتانەم پێبڵێیت کە لەخەڵکی دیکە جیات دەکاتەوە، ئایا دەتوانیت بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و راستەوخۆ وەلامم بدەیتەوە؟

لەوانەیە بۆت دەرکەوێت دیاریکردنی خاڵە لاوازەکانت ئاسانترن لە دیاریکردنی خاڵە بەهێزەکانت، جا ئایا ئەمە بەهۆی خاکی بوونی خۆتەوەیە؟

بەوپێیەی من ڕاهێنەری تایبەتیم (کۆچینگ)، دەمەوێت لەوە دڵنیابمەوە کە تۆ لەژیانی ڕۆژانەتدا ئاگاداری ناخی راستەقینەی خۆتیت و لەگەڵیدا لەپەیوەندیدایت، تۆ ئەگەر بەباشی ئاگاداری خاڵە بەهێزەکانی خۆت بیت و، دەربڕی راستەقینەی خۆت بیت، ئەوە بەئەگەری زۆرەوە دڵت بەخۆت خۆشەو هەستەکەیت متمانەت بەتواناکانی خۆت هەیە، لەهەمان کاتیشدا دەبیتە جێگای ڕێزوپێزانینی کەسانی تریش.

کەواتە هەنگاوی دواترت ئەوەیە هەستیت بە دیاریکردنی خاڵە بەهێزەکانت و، دەستنیشانکردنی هەر تواناو بەهرەیەکی زگماکی یاخود بەدەستهێنراو. هەوڵ بدە کاتی پێویستت هەبێت بۆئەوەی لەشوێنێکی ئارامدا دابنیشیت و راهێنانەکان تەواو بکەیت، لەوانەیە هەست بەوەبکەیت ئارەزووی ئەنجامدانی ئەم راهێنانانەت هەبێت، بەلام بەئەرك نەبێت بەجددی هەوڵ بدە، لەبەرئەوەی کاتێك ئەم هەنگاوە تەواودەکەیت، هەستەکەیت هەستێکی بەهێزت بۆ دروستبووە بەرامبەر خۆت.

**مرۆڤی نموونەیی و سەرکەوتوو ئەوکەسەیە کە بەهێز بەلام بێ بەکارهێنانی توندوتیژی پێشەنگایەتی دەکات.**

## راهێنانی (١): خاڵە بەهێزەکانت

پلاندانـان پێویسـتی بـە بیرکردنـەوەی زۆرو ورد هەیـە، تـۆش داوات لێکـراوە بزانیـت لەکوێـی ژیاندا وەسـتاویت؟ بـژاردەکانی بەردەمـت کامانەن؟ دەتەوێـت بۆکوێ بڕۆیت؟ دەبێـت چـی بکەیـت بۆئـەوەی بگەیتە مەبەسـتەکەت؟ هەمـوو ئەمانـە پێویسـتیان بەوەیە هەڵسـەنگاندن بۆخۆت بکەیت و، بەوردی خاڵە بەهێزو لاوازو هەروەها هەڵوێسـتەکانت شـیکار بکەیت.

**ئـەم راهێنانـە یارمەتیـت دەدات دەسـتبکەیت بەپەرەپێـدانی پلانەکانـت بـۆ داهاتـوو، ئەویـش لەرێـگای خاڵـە بەهێزەکانتـەوە:**

**١- ئەو شتانە بنوسە کە دەتوانیت بەباشی بیانکەیت و، بەدەستیان بهێنیت:**

أ- ...

ب- ...

ت- ...

**٢- ئەو شـتانە بنووسـە کـە چێـژ لەئەنجامدانیـان دەبینیت، یاخود ئاسـتێکی بـەرزی رازی بـوون لەخۆتت پێدەبەخشـن:**

أ- ....

ب- ....

ت- ...

**٣- ئـەو کردەوانـە بنووسـە کـە ئەگـەر ئەنجامیـان بدەیـت دەتکەنە جێـگای رێـزو پێزانینی کەسـانی دیکە:**

أ- ....

ب- ....

ت- ....

## راهێنانی (٢): خاڵە لاوازەکانت

ئەم راهێنانەش وەك ئەوەی پێشوو گرنگە، بۆیە پێویستە بەباشی بیری لێبکەیتەوە

١- ئەو شتانە بنووسە کە ناتوانیت بەباشی ئەنجامیان بدەیت:

أ- ...

ب- ...

ت- ...

پ- ...

٢- ئەو شتانە بنووسە کە چێژ لە ئەنجامدانیان نابینیت:

أ- ....

ب- ....

ت- ....

پ- ....

٣- ئەو هۆکارانە چین وای کردووە لەو شتانەدا لاوازبیت؟

.................................................................................

.................................................................................

.................................................................................

٤- ئایا رێگایەك هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو خاڵانە، وەك: خوێندن، راهێنان، ...؟

.................................................................................

.................................................................................

.................................................................................

٥- ئایا دەتوانم خشتەیەکی کاتی دابنێم بۆ چارەسەرکردنی ئەو خاڵانەی پێویستیان بەباشکردن هەیە؟

.................................................................................

.................................................................................

.................................................................................

## راهێنانی (٣): ئاستەنگەکان

١- ئەو ئاستەنگانە بنووسە کە رووبەڕووت دەبنەوە (کێبڕکێ، ژینگەی کۆمەڵایەتی، کات، خێزان، پارە، تەکنەلۆجیای نوێ، پیشە، دامەزراوە زانستیەکان، مامەڵە داراییەکان، ...):

أ- ....

ب- ....

ت- ....

پ- ....

ج- ....

٢- ئەگەر تەنها یەك ساڵت مابێت لە ژیاندا، چ شتێکی تێدا ئەنجام دەدەیت؟

أ- ....

ب- ....

ت- ....

پ- ....

ج- ...

**«کاتێك ئومێد لەدەستدەدەین ئارەزوو لەدەستدەدەین، کاتێك ئارەزوو لەدەستدەدەین دیدگا لەدەستدەدەین، کاتێك دیدگا لەدەستدەدەین ژیان لەدەستدەدەین، کەواتە ئومێد حەقیقەتی ژیانە و، بەبێ ئەو ناتوانین بژین»**

**ئێستا با لێت بپرسم:**

- ئایا دەکرێت خوێندکارێك رۆژانە زیاد لە ١٠ کاتژمێر کۆشش بکات، بەبێ ئەوەی هیواو ئومێدێکی هەبێت بە سەرکەوتن و رۆیشتن بەرەو زانکۆ؟
- ئایا دەکرێت مرۆڤ پارەکانی بخاتە ناو پرۆژەیەکەوە، بەبێ ئەوەی ئومێدی هەبێت بە بەدەستهێنانی ئەو قازانجەی دەیەوێت؟

- ئایـا دەكرێـت یاریزانێـك كاتەكـەی بـە ڕاهێنانكردنـەوە بەفیڕۆبـدات، ئەگـەر ئومێـدی بەبردنـەوەی پاڵەوانێتیەكـە نەبێـت؟
- ئایا دەكرێت پزیشـكێكی نەشـتەرگەر نەشـتەرگەریەك ئەنجام بدات، بێئـەوەی ئومێدی بەسـەركەوتنی نەشـتەرگەرییەكە هەبێت؟
- ئایا هەرگیز بووە شتێك بەبێ ئومێد ڕووبدات؟

**بێگومان وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بریتیە لە: نەخێر**

**«ئومێد بریتیە لە خودی ژیان و، بێ ئەو ژیان بوونی نییە»**

تەماشـای دەوربـەرت بكە، دەبینیت زۆربـەی ئەوانەی خۆیان كوشـتووە لەبەرئەوەبووە كـە ئومێدیـان بەژیـان نەماوە، لەلایـەكی ترەوە كەسـانێكی تـر دەبینیت سـەرەڕای هەموو ئەو نارەحەتی و نەخۆشـیە كوشـندانەی تووشـی بوون، بەڵام دەسـتیان گرتووە بەژیانەوەو خۆیـان نەكوشـتووە، ئـەوە بەهـۆی ئەوەوەیـە ئومێدیان بـە رزگاربوون هەیە، ئەو كەسـانە بەتـەواوی لـەوە تێگەشـتوون ئاسـتەنگەكان نابنـە كۆسـپ لەبـەردەم كاروانی ئومێـددا، نەخۆشـیەكان نابنـە ڕێگـر لەبەردەم ڕێـگای ئومێـددا، ئومێـد هێزێكە خوای پـەروەردگار پێـی بەخشـیون، بۆئـەوەی لـەكاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاسـتەنگ و سـەختیەكانی ژیاندا هەسـت بـە پارێزراوی و، دەروون ئاسـودەیی و، ئازایەتی بكەن، ئـەوە ئومێدە باری گرانی ئـازارەكان سـووك دەكات، ئومێـدە دەبێتە ئـەو روناكیەی كۆتایـی تونێلـە تاریكەكەمان بۆ ڕوونـاك دەكاتەوە.

**هەندێك شت هەن بەڕادەیەكی وا خەونیان پێوە دەبینین، وەك ئەوەی ئێستا ئەوشتەمان هەبێت، باوەڕبوون بە هەرشتێكیش وای لێدەكات بێتەدی.**

## راهێنانی (٤): دەرفەتەکان

هـەر بیرۆکـە یـان بارودۆخێکـت هەیـە و، لەوباوەڕەدایـت دەتوانێـت ببێتـە هـۆی باشـکردنی دەرفەتەکانـت بـۆ گەیشـتن بەسـەرکەوتن، بینووسـە. ئەگـەر ڕکابەرەکانـت لاوازن و تـۆ بەهێزیـت (لەکارەکەتـدا شـارەزایت، خـاوەن ناوبانـگ، یـان سـامان یـان پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی یـان دەرفـەتی کار یـان پسـپۆڕی زانکۆیـی یـان ....)ت هەیـە.

١- دەرفەتەکانی بەردەمت بنووسە

أ- ....

ب- ....

ت- ....

پ- ....

ج- ....

٢- ئەگـەر سـەرچاوەیەکی مـادی یـان مەعنـەوی دیارینەکـراوت لەبەردەسـتدا بێـت، ئـەو کارانـە چیـن کـە بـەو سـەرچاوانە ئەنجامیـان دەدەیـت؟

أ- ....

ب- ....

ت- ....

پ- ....

ج- ....

**هەموو دەرفەتەکان بۆ هەموان فەراهەمن، بەڵام دۆڕاوەکان فەرامۆشی دەکەن و، براوەکانیش دەیقۆزنەوە.**

## ڕاهێنانی (٥): بەراوردی لیستەکانت بکە

**خشتەی تایبەت بەبەراوردەکە:**

ئێستا بۆئەوەی سوود لەو ڕاهێنانانەی پێشوو وەرگریت، وەرەو بە سودوەرگرتن لە خاڵە بەهێزو دەرفەتەکانی بەردەمت، هەروەها خاڵی لاواز و بەربەستەکانی بەردەمت، ستوونی (أ، ب)ی ئەم خشتەیەی خوارەوە پڕبکەرەوە:

| | أ | ب |
|---|---|---|
| | **خاڵی بەهێز (أ)** | **خاڵی لاواز (ب)** |
| **ناوخۆیی** | | |
| | **دەرفەت (ج)** | **ئاستەنگەکان (د)** |
| **دەرەکی** | | |

ئێستا چوار خانەت لەبەردەمدایە، کە پێکدێن لە خاڵی بەهێزو، خاڵی لاوازو، دەرفەت و ئاستەنگ، هەنگاوی دواتر بریتیە لە لێکدانی ئەم خانانە بەڕێگایەکی ئەوتۆ لە پلاندانان بۆ داهاتووت یارمەتیت بدات.

## یەکەم: تەماشای خاڵە بەهێزەکانت بکە

**خاڵە بەهێزەکانت:** بریتیە لەو کارانەی ئارەزووت لەئەنجامدانیان هەیەو باشیان لێدەزانیت، لەگەڵ ئەو دەرفەتانەی لەبەردەستتدایەو پەیوەندیان بەخاڵە بەهێزەکانتەوە هەیە، هەروەها ئەو خاڵە بەهێزانەی هۆکاری بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ دەرفەتەکانی بەردەمت، کە بریتین لەوانەی لە خانەی (أ)دان.

ئەمانە بێنەو بەباشی شیکارییان بۆ بکەو جارێکی تر بیریان لێبکەرەوە، لەبەرئەوەی سەرچاوەی گەورەترین ئەگەرە شاراوەکانی ناختن بۆ گەشەکردنت. ڕەنگە یەکێك لە دەرفەتەکانت بەهۆی نەبوونی ڕکابەرەوە بێت، یاخود بەهۆی ئەوەبێت کە ژمارەیەکی زۆر کڕیارت هەیە، یاخود جۆرێکی نوێی بەرهەمت هەبێت، ئەم دەرفەتە لەگەڵ ئەو

ئارەزوو ویستەی هەتە بۆ ئەنجامدانی کارێکی جددی و قورس تێکەڵ بکە، سەرەنجام دەبێتە هۆی زیادبوونی دەرفەتەکانت بۆئەوەی ببیتە کەسێکی سەرکەتوو لەو بوارەی دەتەوێت، هەموو خاڵە بەهێزو دەرفەتەکان بەبەردەوامی لەخزمەتی تۆدا کاردەکەن، ئەمە ئەگەر هاتوو توانیت لەو پەیوەندییەی نێوانیان (واتە خاڵی بەهێزو دەرفەتەکان) تێبگەیت و بەباشترین شێوە بەکاری بهێنیت.

## دووەم: تەماشای خاڵە لاوازەکانت بکە

**خاڵە لاوازەکان:** بریتیە لەو کارانەی ئارەزووی ئەنجامدانیان ناکەیت، یاخود ماوە نا ماوەیەك هەوڵدەدەیت خۆتیان لێ بەدور بگریت، هەروەها ئاستەنگەکانی بەردەمت، کە دەکەونە ستوونی (ب)ی خشتەکەوە، هەندێك ئاستەنگیش هەن هۆکاری سەرەکیان دەگەڕێتەوە بۆ خاڵە لاوازەکانت، هەروەك هەندێك خاڵی لاوازیش هەن هۆکارەکەیان تەنهاو تەنها دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاستەنگانەی دیاریت کردوون.

نیشانەیەك بخەرە سەر ئەم کۆمەڵانە، لەبەرئەوەی رەنگە هۆکاری پشت گەورەترین کێشەکانت بن، ماوە ماوە بگەڕێرەوە بۆ ئەولیستانەی تایبەتن بە خاڵی لاوازو ئاستەنگەکانی بەردەمت و، ئەو خاڵانە دیاری بکە کە بەهۆیانەوە دەتوانیت خۆت لە خاڵە لاوازو ئاستەنگەکان رزگارکەیت، بەتایبەتی ئەوانەیان لەدژت کاردەکەن و، دەبنە رێگری نێوان تۆو سەرکەوتنت.

## سێیەم: هەوڵ مەدە بەراوردی نێوان خاڵە لاوازو ئاستەنگەکانت بکەیت

ئەو ئاستەنگانەن دەکەونە سندوقی (د)ەوە، هەوڵ مەدە لەڕێگای ئەنجامدانی ئەو کارانەوە کە باشی لێنازانیت یاخود ئارەزووی ئەنجامدانیانت نییە دەرفەت پەیدا بکەیت، واتە هەستیت بەئەنجامدانی خاڵە لاوازەکانت کە لە سندوقی (ب) دان، لەبری ئەوە تەرکیز بخەرە سەر لێکدانی خاڵی لاواز و دەرفەتە روون و ئاشکراکانت، خۆت بەدوور بگرە لە لێکدانی خاڵی لاوازو ئاستەنگەکان، خۆ ئەگەر سەرکەوتووبویت لە پێکهێنان و دروستکردنی ئەو کۆمەڵانەدا ئەوە (٨٠٪ - ٩٠٪)ی کاتەکانت لە کەشوهەوایەکی یارمەتیدەرو لە ئەنجامدانی ئەو کارانەدا بەسەردەبەیت کە دەتەوێت جێبەجیان بکەیت، تەنها (١٠٪ - ٢٠٪)ی کاتەکانت لەوکارانە بەسەر دەبەیت کە چێژ لەئەنجامدانیان وەرناگریت، یاخود زۆر باشی لێ نازانیت، وەك دەبینیت زۆربەی شتەکان لەبەرژەوەندی تۆدا دەبن.

## چوارەم: شیکارکردنی بژاردە ستراتیژییەکان:

| | خاڵی بەهێز | خاڵی لاواز |
| --- | --- | --- |
| دەرفەت | تاچەند دڵنیایت لە هەبوون و سوود لێوەرگرتنیان؟ | لاوازی/ دەرفەت = گۆڕان<br>ئەو دەرفەتانە کامانەن یارمەتیت دەدەن بۆ ڕزگاربوون لە خاڵە لاوازەکان؟ |
| ئاستەنگ | هێز/ ئاستەنگەکان = هەمەجۆری<br>ئەو خاڵە بەهێزانە چین یارمەتیت دەدەن بۆ ڕزگاربوون لە ئاستەنگەکان؟ | لاوازی/ ئاستەنگەکان = بەرگری<br>چۆن دەتوانیت خاڵە لاوازەکان کەمکەیتەوەو، لەگەڵ ئاستەنگەکاندا کۆیان نەکەیتەوە؟ |

**شێوازی (کێشانەکردنی) خاڵی توانا ناوخۆیی و، دەرەکییەکان و، هەڵبژاردنی باشترین ستراتیژییەت:**

ئێستا لە خشتەکاندا گرنگترین سێ خاڵی بەهێز بنوسەو، بەگوێرەی بەهێزیان ریزیان بکە، پاشان لەسەر (١٠) نمرەیان بۆ دانێ، ئینجا کام لەو سێ خاڵە زۆرترین نمرەی وەرگرتبوو جارانی (٣)ی دەکەین، دووەم خاڵ جارانی (٢) دەکەین و، سێیەم خاڵیش جارانی (١) دەکەین، پاشان وەك ئەوشێوەیەی لەم خشتانەی خوارەوەدان ئەنجامەکان کۆدەکەینەوە، دواتر هەمان پرۆسە بۆ خاڵە لاوازەکان و، دواتریش بۆ دەرفەتەکان و، ئینجا بۆ ئاستەنگەکان ئەنجام بدە:

| ١- خاڵی بەهێزو دیاریکردنی لە ١٠ | | | پاشان جارانکردنی لەگەڵ ژمارەکەی بەرامبەری و کۆکردنەوەی ئەنجامەکە | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | دەستپێشخەری | ١٠ | ×٣= ٣٠ | کۆی هەمووی = ٥٦ |
| ٢ | متمانەبەخۆبوون | ٩ | ×٢ = ١٨ | |
| ٣ | ڕێکخستن | ٨ | × ١ = ٨ | |

| ٢- خاڵی لاوازو دیارکردنی لە ١٠ | | | پاشان جارانکردنی لەگەڵ ژمارەکەی بەرامبەری و کۆکردنەوەی ئەنجامەکە | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | نەخۆشیە جەستەییەکان | ٦ | ×٣= ١٨ | کۆی هەمووی = ٣٢ |
| ٢ | زۆری کاروبار | ٥ | ×٢ = ١٠ | |
| ٣ | ڕێکخستن | ٤ | × ١ = ٤ | |

| ٣- دەرفەتەکان و دیارکردنی لە ١٠ | | پاشان جارانکردنی لەگەڵ ژمارەکەی بەرامبەری و کۆکردنەوەی ئەنجامەکە | | |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بوونی سەنتەری تایبەت | ٩ | × ٣ = ٢٧ | کۆی هەمووی = ٥٠ |
| ٢ | پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان | ٨ | × ٢ = ١٦ | |
| ٣ | ئاستی خێزانی | ٧ | × ١ = ٧ | |

| ٤- ئاستەنگەکان و دیارکردنی لە ١٠ | | پاشان جارانکردنی لەگەڵ ژمارەکەی بەرامبەری و کۆکردنەوەی ئەنجامەکە | | |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کاروباری کارگێڕی | ٧ | × ٣ = ٢١ | کۆی هەمووی = ٣٩ |
| ٢ | زۆری ئیش پەکخەرەکان | ٦ | × ٢ = ١٢ | |
| ٣ | خزم خزمێنە | ٦ | × ١ = ٦ | |

بەرزترین خاڵ خاڵی بەهێز (٥٦) و، دوای ئەو دەرفەتەکان (٥٠)ە = ١٠٦

هێز + دەرفەت = ستراتیژییەتی رکابەری ئازا و دەستپێشخەر

## راهێنانی (٦): ئەنجامدان

١- گرنگترین ئەو کارانە چین کە ئەنجامتداون و، بەهۆیانەوە هەست بەبەهێزی دەکەیت؟

أ- ...

ب- ....

ت- ....

پ- ....

ج- ....

٢- گرنگترین سێ یان چوار کاروباری ژیانت چین، کە لەژیانتدا ئەنجامت داون؟

أ- ....

ب- ....

ت- ....

پ- ....

ج- ....

**٣- كاتێك تەماشـای ئـەو كارانـە دەكەیـت كـە رۆژانـە ئەنجامیـان دەدەیـت، گرنگتریـن كاریـان كامەیـە كـە ئەنجامـی دەدەیـت؟**

أ- ...

ب- ...

ت- ...

## راهێنانی (٧): مۆزەخانەی تایبەتی

هـەوڵ بدە هەموو ئەو شـتانە بیرخـۆت بێنیتەوە كە شـانازیان پێوە دەكەیـت: (بڕوانامە، نیشـانە، خـەڵات و وێنـەی یـادگاری و، جـام و، ....)، ئامانـج لـەم راهێنانـە بریتیـە لەزیادكـردنی ئاسـتی تێگەشـتنت لەخـۆت و بەهـاو نرخی خـۆت، هەروەهـا جوڵاندنی ئـارەزووی جوڵەكـردن و، متمانەبەخۆبـوونی زیاتـر، راهێنانەكـەش بەمجۆرەیـە:

**وابێنـە بەرچـاوت بڕیارتـداوە مۆزەخانەیـەكی تایبـەت بەخـۆت دروسـت بكەیـت و، هەمـوو ئـەو شـتە تایبەتیانەت لەخـۆ بگرێت كـە دەتەوێت نیشـانی خەڵكی بدەیـت، وەك:**

- ئەو كارانەی لەژیانتدا ئەنجامت داون.
- ئەو بەرهەمانەی دروستت كردوون.
- ئەوبیرۆكانەی داتهێناون.
- ئەو پەرتووك و كارانەی چاپت كردوون، یاخود چاپیان دەكەیت.
- ئەو كەرەستانەی بەكارت هێناون.
- ئەو هۆنراوەو قسە جوانانەی خۆت، یان هی كەسانی تر كە زۆر حەزت لێیانە.
- وێنەی تایبەتی خۆت، كە یاوەری زۆر نازداریان بۆ تۆ تێدایە.
- وێنەی خێزانە بەڕێزەكەت.
- پڕۆژەی ئاییندەیی كە دەتەوێت ئەنجامیان بدەیت.
- ئەو خەڵاتانەی لەلایەن خۆشەویسترین خەڵكەوە پێت دراون.

ئەمە مۆزەخانە تایبەتیەکەتە، ئازادیت لەوەی هەر کەرەستەو بیرۆکەیەکت هەیە تیایدا دابنێیت، داوات لێدەکەم قەڵەم و کاغەزێك بێنەو، وێنەیەکی ئەندازەیی سادە و ئاسان بکێشە (نمونەیەکی سەرەتایی) بۆ دابەشکردنی مۆزەخانەکەت، بۆ نمونە: لایەك بۆ وێنە تایبەتیەکانت، لایەك بۆ گرنگترین دەستکەوتەکانت، لایەکی تریش بۆ گرنگترین ئەو کەسایەتیانەی لەژیانتدا بینیوتن و، لایەکی دیکەش بۆ پرۆژەکانی داهاتووت و، ....هتد

داهێنەربە، لەیادت بێت هەتاوەکو زیاتر بچیتە ناو وردەکاریەکانەوە، مۆزەخانەکەت بەسوودتر دەبێت، دوای ئەوە هەستە بە دیاریکردنی شتەکان و بیانخەرە شوێنی دیاریکراوی خۆیانەوە، بۆنمونە: ئەو دیارییانە چین شانازیان پێوە دەکەیت؟ ئەو وێنانە کامانەن دەتەوێت بیانخەیتەڕوو؟ پاشان لە مۆزەخانەکەتدا دایان بنێ.

**ئەو وشە یان قسە جوانە کامەیە شانازی پێوە دەکەیت و، لە دەروازەی مۆزەخانەکەتدا دای دەنێیت؟**

**دوای دروستکردنی مۆزەخانەکەت، لە خەیاڵی خۆتدا وێنەیەکی زەینی بۆ دروست بکە و، باهەمیشە ئەو وێنەیە لەزەینتدا ئامادەبێت.**

## چیرۆکی سەرکەوتنی شۆفێری تەکسیەك

**شۆفێری تەکسیەکی سادە چۆن ئەنجامی دا و، تۆش چۆن دەتوانیت ئەنجامی بدەیت؟!**

خاوەن تەکسیەك هەبوو بەدەست باوردۆخێکی دارایی سەختەوە دەیناڵد، یەك پرسیار بیری داگیرکردبوو: چۆن خۆم هەستێنمەوە؟ چۆن ئەم بارودۆخە تێپەڕێنم؟ ڕێك وەك ئەوەی هەمان پرسیار بیری ئێمەشی داگیرکردووە، ڕۆژێك لەکاتی کارکردن لەیەکێك لەشەقامەکانی لەندەن، لە رادیۆوە گوێی لە بزنسمانێك بوو دەیوت: ئەوەی هەتە بەباشی بەکاری بهێنە، شۆفێرەکە وەستاو بیری کردەوەو لەخۆیی پرسی و وەڵامی دایەوە: خاوەنی ئەم تەکسیەم کە بەدرێژایی شەو کاری پێدەکەم و، بەدرێژایی ڕۆژیش بەبێ ئیش دەوەستێت، کەواتە پێویستە بەڕۆژیش بیخەمە ئیش، بۆئەوەی بەباشی بەکاری بهێنم، بڕیارەکەی ئەوەبوو بەڕۆژ بیدات بەکرێ، لەماوەیەکی کەمدا بڕەپارەیەکی زیادەی هاتەدەست و ئۆتۆمبیلێکی دیکەی کڕی و ئەویشی دا بەکرێ، دوای چەندساڵێکی کەم بوو بەخاوەنی کۆمەڵە ئۆتۆمبیلێکی زۆر و، بەشەقامەکانی لەندەندا هاتوچۆیان بوو، ئەم هاوڕێیەمان جارێکی تر وەستاو دیسانەوە بیری لەو

ڕستەیە کردەوە کە ئاڕاستەی ژیانی گۆڕی: «بزانە چیت هەیە و بەباشی بەکاری بهێنە»، بۆیە بڕیاریدا ئۆتۆمبیلەکانی بەکاربێنێت بۆ ڕیکلامکردن!! بیری کردەوەو بڕیاریدا لەڕێگای ٥٠ دانە لە ئۆتۆمبیلەکانیەوە ڕیکلام بۆ ئەنجامدانی سەردانکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکات، هەریەك لەو ئۆتۆمبیلانەش ڕیکلامی سەردانکردنی یەکێك لە ویلایەتەکانی لەسەربێت، شۆفێرێك کە شارەزای ئەو ویلایەتەبێت لێی بوخڕێت، هەستا پەیوەندی کرد بە سەفارەتی ئەمریکیەوەو، ئەوانیش بە دامەزراوەی (سەردانی ئەمریکا بکە)یان ناساند، دوای ئەوەی بیرۆکەکەی بۆ خستنەڕوو زۆریان بەدڵبوو، بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکەکەشی نزیکەی (٤٠٠) هەزار جونەیهی ئوسترالیان دایە.

لەخۆت بپرسە: چیم هەیە؟ چۆن دەتوانم بەباشی بەکاری بێنم؟ وریابە! شتەکان لەخۆت قورس مەکە، مەرج نییە خاوەن بەهرەیەکی بێوێنە یان شتێکی دەگمەن بیت، هەر ئێستا دەست پێبکە.

چیت هەیە بینووسە، پلان دابنێ ... چۆن بەباشی بەکاری دەهێنیت بۆئەوەی خۆت هەستێنیتەوە؟؟





# قۆناغی دووەم

## بەئامانجکردن
## (دیدگاو پەیام و ئامانج)

دیدگا....

پەیام...

ستراتیژییەتی زیادکردنی پاڵنەرە ناوخۆییەکان...

ئامانج...

رێگا کردارییەکانی دارشتنی دیدگاو پەیام و ئامانج...

هەنگاوی یەکەم: وروژاندنی خەون و خولیاکان...

هەنگاوی دووەم: هاوسەنگیکردن لە بوارەکانی ژیاندا...

هەنگاوی سێیەم: دارشتنی دیدگاو پەیام و ئامانج...

دیدگاو پەیام و هاوسەنگی ناوخۆیی...

دیدگاو پەیام و تەکنیکی «ئاستە لۆجیکیەکان».

روونی ئامانجەکان یەکێکە لە پایەکانی سەرکەوتنی پلانی کەسی.

نیشانە پێویستەکانی ئامانجە ستراتیژییە باشەکان.

## دیدگا (الرؤیة)

**بریتیە لەو شتەی دەتەوێت لەداهاتوودا بیگەیتێ.**

**وێنەیـــەکی زەینی پرشــــنگدارە بۆ ئەوشـــتانەی دەتەوێـــت لەداهاتـــوودا خۆت یان دامەزراوەکـــەت بیهێنیتەدی:**

١- دیدگا وێنەیەکی زەینی ئەرێنی روون لەبارەی داهاتووەوە دروستدەکات.

٢- دیدگا پێویستە لەچوارچێوەی کاتێکی دیاریکراودابێت و، شیاوی پێوانەکردن بێت.

٣- دیدگا پێویستە گەورەبێت و لەهەمان کاتیشدا واقعی بێت.

٤- دیدگا پێویستە رەنگدانەوەی خاڵی جیاوازی تۆبێت.

٥- دیدگا هانی خەڵك دەدات واز لە روانینی کورت مەودا بێنن و، لەبری ئەوە دوور بڕوانن.

٦- دیدگا دەبێتە هۆی ئەوەی چالاکیەکانی رۆژانەمان گرنگی و مانایان هەبێت.

٧- دیدگا پێویستە شیاوی پەرەپێدان بێت.

٨- دیـدگا پێویسـتە ناسـنامەیەکی نمونەیـی تازە بـۆ سـەرکردەو گرووپەکـەو کۆمەڵگەش بێنێتە دی.

**بارودۆخی خۆتت وەك خۆی قبوڵ بێت، پاشان پلان دابنێ بۆ چارەسەرکردنی لایەنە نەرێنیەکانی و، بەباشی بەکارهێنانی لایەنە ئەرێنیەکانی، لەدونیای خەیاڵدا مەژی، بەڵکو ژیانی خۆت چۆنە ئاوا بژی.**

## پەیام (الرسالة)

بریتیـــە لــــەو مەبەســـتەی مـــرۆڤ لەژیانـــدا هەیـــەتی، بریتیە لــــە هاندان و ئیلهامبەخشـــین و جوڵاندن بەرەو هێنانـــەدی دیدگا، ئەو پاڵنەر یـــان هاندەرەیە کە مرۆڤ بۆ خۆیـــی دادەنێت و دەیکاتە چـــرای رێگای ژیانی، پەیـــام ئامانجێك نییە بەهێنانـــەدی کۆتایی بێـــت، بۆیە نابێـــت پەیامەکەم بریتی بێت لـــەوەی ئۆتۆمبیلێك بکـــڕم، ئەمە پەیام نییـــە، بەڵکو ئامانجێکـــە دادەنرێت بۆئـــەوەی یارمەتیم بدات لە هێنانـــەدی پەیامەکەمدا، پەیامی باشـــیش دەبێت:

١- کـورت بێـت: چەنـد دەسـتەواژەیەکی کـورت و پوخـت بێـت، بۆئـەوەی لەزەینـدا بمێنێتـەوە، وەك ئـەوەی بڵێیـت: پەیامـم بریتیـە لەبەژداریکـردن لـە بڵاوکردنـەوەی

هۆشـیاری و، یارمەتیـدانی کەسـانی تـرو، گوێڕایەڵیکـردنی خـوای گـەورە.

٢- **مرونـەتی تیادابێـت:** بەجۆرێـك ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە و، بتوانرێـت پەرەی پێبدرێت و بەرەو پێشـەوە ببرێت.

٣- **جیاوازبێـت:** زیادەیـەك بخاتـە سـەر ژیانـت و، لەکەسـانی تـر جیـات بکاتـەوە، پێغەمبەرمـان درودی خـوای لەسـەربێت لەڕوونکردنـەوەی پەیامەکەیـدا فەرمـووی: مـن بۆئـەوە نێـردراوم رەوشـتە جوانـەکان تەواوبکـەم.

٤- **هاندەربێت:** ئەو بەهایانەی تێدابێت کە هاندەرە بۆ کردارو، پاڵنەرە بۆ دیدگا.

## هانـدان (التحفیز):

بریتیـە لـەو کۆمەڵـە پاڵنـەرەی هانمـان دەدەن بـۆ ئەنجامـدانی کارێـکی دیاریکـراو، بـەوەی ئـەو بەهایانـەی تیـادا بچێنیـت یـان بیـری بخەیتـەوە، کـە پاڵـی دەنێـت و، هانی دەدات بۆئـەوەی بـەوردی کارەکانی بـکات و، لـەکاتی پێویسـتدا تەواویـان بـکات.

هانـدان پێـشی دەوترێت: جـوڵان بەرەو پێشـەوە، بریتیە لە هەموو قسـە یان کـردار یان ئاماژەیـەك کە پـاڵ بەمرۆڤەوە دەنێـت بۆ ئەنجامدانی هەڵسـوکەوتێکی دیاریکـراو، یاخود بەردەوامبـوون لەسـەری، هاندان پەرە بە پاڵنـەرەکان دەدات.

بـەڵام جیـاوازی نێـوان هانـدان و پاڵنـەر ئەوەیە کـە هانـدان دەرەکییە، جا ئەگـەر لەناو مرۆڤەکـەدا پاڵنـەر هەبـوو، ئـەوە لەگـەڵ هاندانـدا یەکدەگـرن و هەڵوێسـتی مرۆڤەکـە بەهێزدەکـەن، بـەڵام ئەگـەر پاڵنـەری نـاوەکی نەبـوو، ئـەوە تەنهـا هانـدانی دەرەکی دەمێنێتـەوە، کـە بریتیـە لـە هەڵنانمـان لەلایەن کەسـانی ترەوە، بۆئـەوەی سـوودی بۆمان هەبێـت پێویسـتە مرۆڤەکـە کـرداری پێبـکات.

- هانـدانی بەهێـز کاتێـك روودەدات کـە لێهاتوویـیـەکانی مرۆڤەکـەو ئاسـتەنگەکان یەکسـان بن.
- ماندوویی کاتێك دێتەدی کەسەکە خاوەنی لێهاتوویەکی بەرزبێت و ئاڵنگارییەکان کەمبن.
- بێئومێـدی کاتێـك دێتـەدی کەسـەکە خـاوەنی لێهاتوویـیـەکی کـەم و ئاڵنگارییەکی گەورەبێـت، نمونـە: (کەسـێك دەرفەتێکی گـەورەی هەیە بۆئـەوەی ببێتـە راهێنەر، بـەڵام تەکنیکـەکانی راهێنـان نازانێـت، بۆیـە تووشـی بێئومێـدی دەبێت).
- چێژبینیـــن لەکار کاتێـــك دێتەدی مرۆڤەکە خـــاوەنی لێهاتوویـیـــەکی بەرز و، ئاڵنگارییـــەك بێت لەگـــەڵ لێهاتوویەکەیـــدا بگونجێت.

- لەکاتی هەستکردنت بە شەکەتی، ئاستی ئاڵنگارییت بەرز بکەرەوە.
- لەکاتی هەستکردنت بە فشاری زیادە، ئاستی لێهاتووییەکانت بەرز بکەرەوە.
- وانـەی یەکەمـی هانـدان ئەمەیـە کـە: بۆئـەوەی هانـدان سـوودی هەبێـت دەبێـت بـەردەوام بێـت.
- وانـەی دووەمـی هانـدان ئەمەیـە کـە: لەدەسـتدانی ئارامـی، پاڵنـان و هەنـدان دەکوژێـت.
- وانـەی سـێیەمی هانـدان ئەمەیـە کـە: بەشـێوەیەکی گونجـاو خـۆت هـان بـدە، بۆئـەوەی بگەیـت بـە پاڵنـەری ناوخۆیـی.

## جۆرەکانی هاندان

١- **هانـدانی دەرەکی:** ئـەو جـۆرە پاڵنەرەیـە کـە پشـت بـە هانـدانی دەرەکی دەبەسـتێت، کەواتە ئەم جۆرە پشـت بەکەسـانی دەوروپشت دەبەسـتێت، هەربۆیە کاریگەرییەکەی بەخێرایـی لادەچێـت، جـا ئەگـەر ڕۆژێـك لـەڕۆژان بەگەرموگوڕییەوە ئیشـت کردو، لەسـەر ئەوکارە خاوەن ئیشـەکەت هـانی دایـت و، ڕۆژی دواتر لێت توڕەبوو لەسـەر ئـەوەی بەباشـی ئیشـت نەکـردووە، ئەوە ئـەو هاندانـەت بیردەباتەوە کە ڕۆژی پێشـتر وەرت گرتبوو.

ئەگەر هاوڕێیەکت هانی دایت بۆ بەژداریکردن لە خولێکی فێربوونی مەلەوانی و خۆشی لەگەڵتدا هات بۆ خولەکە، تۆش دەڕۆیت و بەژداری دەکەیت، ئەگەر نەشهات ئەوە تۆش ناچیت و بەژداری ناکەیت. بۆیە چوونت بۆ ئەو خولە بەهۆی هاوڕێکەتەوەیە، نەك ئەوەی خۆت ئەو ویست یان ئارەزووەت هەبێت، یاخود خولیای خۆت بێت و حەزبکەیت ئەنجامی بدەیت و، بەهۆیەوە چێژو خۆشی بەدەروونت ببەخشیت.

پاڵنـەرە دەرەکیـەکان بـۆ ماوەیەکی کورت بـەردەوام دەبـن و، ئەوکاتـەی کارەکە ئەنجام دەدەیـت کۆتایی دێت.

**زۆر پشت بە پاڵنەرە دەرەکیەکان مەبەستە، لەبەرئەوەی تەنها هۆکارێکی یارمەتیدەرن.**

ئێمـە پەنـا دەبەینە بـەر پاڵنـەرە دەرەکیـەکان بۆئەوەی هانمـان بـدات و گەرموگوڕیمان پێ ببەخشـێت، لەوانەیە پێویسـتمان بەهەندێك پیاهەڵدانیش هەبێت، هەموو کەسـێکیش دڵـی بە ڕێـزو پێزانین خۆشـدەبێت، پاڵنـەرە دەرەکیەکانیش وەك:

- وتارێك كە لەڕێگای كاسێت یان سی دی یان یوتیوبەوە گوێت لێبووە.
- بەژداری خولێكی راهێنانت كردووەو كاری تێكردویت.
- بەژداری كۆڕێكت كردووە، كە ژمارەیەكی زۆر كەسایەتی ناودار ئامادەی بوون.

- كاریگەری ئەو خول یان كۆڕ یان كاسێتە بۆماوەی چەند لەسەرت دەمێنێتەوە؟
- ئـەو زانیارییانەی لـەو خولی راهێنانەوە وەرت گرتووە هەتا كـەی بیرت دەمێنێتەوەو سـەرچاوەی هاندانت دەبێت؟

**ئەگەر چاوەڕێی سوپاس و پێزانینی خەڵك بكەیت، ئەوە بێئومێد دەبیت.**

٢- **هاندانی ناوخۆیی:** پاڵنەری كەسـە سـەركەوتووەكان لەناو ناخی خۆیانەوە سـەرچاوە دەگرێـت، ئـەوەش بەهێزترین جـۆرەكانی پاڵنـەرەو، بریتیـە لـەو ئـارەزووە بەهێـزەی پـاڵ بەمرۆڤـەوە دەنێت بـۆ جوڵەكردن و ئاراسـتەكردنی خۆی بەرەو سـەركەوتن، هەر كارێـك بكات سەردەكێشـێت بۆ بەدەسـتهێنانی ئـەو ئەنجامانـەی دەیەوێت.

بۆیـە پێویسـتە بزانیـت ژیانـت دەسـتكردی خۆتـە، كەواتـە كەساسـی و رۆژڕەشـی بـژاردەی خۆتـە، هەروەهـا بەختەوەریـش بـژاردەی خۆتـەو، شكسـتیش هـەر بـژاردەی خۆتـە، سـەركەوتن بڕیـاری خۆتـە، ئـەم پاڵنەرانـە ماوەیـەكی زیاتـر دەمێننـەوەو لەپاڵنەرە دەرەكیەكانیـش زۆر بەهێزتـرن.

پاڵنـەرە ناوخۆییـەكان لەناخی خۆتـەوە دێنەدرەوەو، وەڵامگۆی تێركـردن و پڕكردنەوەی پێویسـتییەكی خۆتـن، ئـەو ئارەزوویە كـە بەوپەڕی بـاوەڕو دڵنیاییـەوە لەناخـی مرۆڤەكە خۆیـەوە هەڵدەقوڵێـت و، دەیجوڵێنێـت بەرەو ئەوشـتانەی دەیەوێت.

هەتاوەكـو خواسـتە ناوخۆییـەكان بەهێزتربـن، پاڵنـەرەكانی مـرۆڤ بەهێزتـر دەبـن و، ئاگـر بەردەدەنە مەشـخەڵی سـووربوون و، ویسـتی بەهێزی كەسـەكە بەرەو سـەركەوتن.

یەكێـك لە هانـدەرە ناوخۆییە بەهێـزەكان بریتیە لە داڕشـتنی ئەو ئامانجانـەی دەتەوێت بیانهێنیتـەدی و، پـلان دانا بۆیان.

هەمـوو رۆژێـك چەنـد خولەكێـك لـەكاتی بەنرخـی خـۆت تەرخـان بكـە بۆئـەوەی پشـوویەكی كەمـی تیـادا بدەیـت و بیربكەیتـەوە، چاوەكانـت داخەیـت و خـۆت ببینیت توانیوتـە ئـەو ئامانجانە بەدی بێنیـت كە‌ویسـتووتن، هەموو رۆژێك لەسـەر ئەمە راهێنان بكـە، دەبێتـە هـۆی گەشـەكردنی پاڵنـەرە ناوخۆییەكانت.

بڕوانامـەکانی سـوپاس و پێزانیـن و، ئـەو میدالیایانـەی لـە ژیانتـدا بەدەسـتت هێنـاون و، ئـەو دەسـتکەوتانەی بەدەسـتت هێنـاون و شـانازیان پێـوە دەکەیـت، هەمـوو ئەمانـە بێنـەو لەجێگایـەکی دیـاری ژوورەکەتـدا دایـان بنێ، بۆئـەوەی ببنـە سـەرچاوەی هاندان و پاڵنـەری بەردەوامـت، بـەڵام لەگـەڵ کەسـانی نەرێنیدا باسـی دەسـتکەوتەکانت مەکە، بۆئـەوەی ئێرەییـت پێنەبەن.

**لەوکەسانە دوور بکەوەرەوە کە بەچاوی کەمەوە تەماشای خولیاکانت دەکەن، کەسی گەورە ئەوەیە وات لێبکات هەست بکەیت تۆش دەتوانیت مەزن بیت.**

## ستراتیجیاتەکانی زیادکردنی پاڵنەری ناوخۆیی

١- **دوبارەکردنـــەوەی ئەرێنـــی:** بەکارهێنـــانی وشـــەو دەســـتەواژەی ئەرێنی لەکاتی خۆدواندندا.

جـا ئەگـەر بەخۆتـت وت: من متمانـەم بەخـۆم هەیە، لەگەڵ وتنی ئەمەشـدا هەسـت و سـۆزی پاڵنـەر هەبـوو، دواتـر چەندیـن جـار ئەمەت دووبـارە کـردەوە، ئەوە تـۆ دەبیتە خـاوەنی دەرونێکی خـاوەن متمانە، لەبەرئەوەی ئـەو باوەڕە نەرێنیانەی هەتە بە ویسـتێکی پۆڵاییـن و پابەندبـوونی تـەواو نەبێـت تێـك ناشـکێت، بۆیە با هێـزی ئیـرادەت هۆکاری سـەرەکیت بێت بەرەو سـەرکەوتن.

٢- **نوسـینی ئامانجەکانـت:** بەشـێوازێکی روون و، دیاریکـردنی کاتی گونجـاو بـۆ بەدیهێنانیـان، پێویسـتە ئەو ئامانجـەی دەتەوێـت بیهێنیتەدی لەبەردەمتـدا دای بنێیت، بەیانیـان جارێـك و کاتی نوسـتنیش جارێـك بیخوێنیتـەوە.

٣- **تەکیـزی ئەرێنـی لەسـەر ئامانـج و هـۆکارەکانی بەدیهێنانیان:** ئەگەر بـاوەڕت بە هێزی باوەڕەکانـت هێنـا، ئەوە دەبێتە کانگا و سـەرچاوەی هێـزو سـەرکەوتنت، لەبەرئەوەی مـرۆڤ ئەگـەر پێشـوەختە ئەنجامەکـەی لەپێشـچاوبوو، لەدڵـی خۆیـدا بـاوەڕی پێی هەبـوو، ئـەوە نەسـتی ئاراسـتەی دەکات بەرەو ئـەو ئەنجامـەی دایناوە.

٤- **سـەرلەنوێ پـلان بـۆ ئامانجەکـەت دابنێـرەوە:** تەرکیـزی ئەرێنـی خسـتنە سـەر ئامانج

و هـۆکارەکانی و، پلاندانـان بـۆی، تەرکیـزو هاندانێـکی ناوخۆیی بەهێـزت دەداتێ، بۆیـە بگەڕێـرەوە بـۆ سـەرلەنوێ داڕشـتنەوەی ئامانجەکـەت و پـلانی بـۆ دانێ.

٥- **نوسـینی ئەنجامـەکان:** پێویسـتە ئـەو ئەنجامانـە بنووسـیت کـە دوای بەدیهێنـانی ئامانجەکانـت دەسـتت دەکەوێـت، بـەردەوام لەخۆت بپرسـە، ئەگەر ئـەم ئامانجانەم هێنایـەدی چـی روودەدات؟

٦- **مرونـەت:** پابەندبـە بەئامانجەکەتەوە، ئەگەر پلانەکەت لەگـەڵ تواناکانتدا نەدەگونجا، ئـەوە ئاسـاییە گۆڕانـکاری تێـدا بکەیـت، تـۆ خـۆت پلانەکـە دادەنێیـت و تواناکانی خـۆت دەناسـیت، وە هـەر خۆت لەپێشـتریت بەوجـۆرەی لەگـەڵ بارودۆخی خۆتدا دەگونجێـت گۆڕانکاری تێـدا بکەیت.

٧- **دەفتـەری دەسـتکەوتەکانی رۆژانـە:** هەمـوو رۆژێـك بـەلانی کەمـەوە پێنـج شـت بنووسـە کـە ئەنجامـت داون، لەکۆتایی رۆژەکەشـدا وەك پاداشـتێك بـۆ هەوڵەکانت و، هانـدانی خـۆت بـۆ ئەنجامـدانی کاری دیکە، بیانخوێنـەرەوە، هەروەها هەسـتە بە سـڕینەوەی ئـەو ئامانجانـەی بەدیـت هێناون.

٨- **پێشـەنگی خـۆت دیـاری بکـە:** ئـەو کەسـە دیـاری بکـە دەتەوێـت چـاوت لەسـەری بێـت و وەك ئەوبیـت، بۆئـەوەی ببێتـە سـەرچاوەیەکی هاندانـت.

٩- **پاداشـتی خـۆت بکـە:** رێـزو پێزانیـن بۆخـۆت دەربـڕە، هەرکاتێـك هەسـتایت بـە ئەنجامـدانی ئەرکەکانـت، یاخـود لـە تاقیکردنەوەکانتدا سـەرکەوتووبویت، پاداشـتی خـۆت بکـە، وەك رۆشـتن بـۆ گەشـت یـان سـەردان یاخـود کڕینـی دیاریـەك بۆخۆت.

١٠-**وێنـەی داهاتـوو لەبـەردەم خۆت دابنێ:** وێنەیـەکی ئەو داهاتووەی دەتـەوێ بیگەیتێ، یاخود ئەو وشـانەی کـە داهاتـووت بیردێننەوە، لەبەردەمـی خۆتدا دابنێ.

**پاڵنەرەکان ئەو رووناکیەن رێگا بۆ مرۆڤ رووناك دەکەنەوە، ئەو چرایەن رێنماییمان دەکەن.**

## ئەگەر هەستت کرد پاڵنەرەکانت بۆ هێنانەدی ئامانجەکانت شلۆقن؟

گرنگترین ١٠ هۆکار بنووسە کە بۆ هێنانەدی ئامانجەکانت هانت دەدەن:

١- ..........................................................................

٢- ..........................................................................

٣- ..........................................................................

٤- ..........................................................................

٥- ..........................................................................

٦- ..........................................................................

٧- ..........................................................................

٨- ..........................................................................

٩- ..........................................................................

١٠- ..........................................................................

پارێزگارییان لێبکە، چونکە ئەم هۆکارانەن پاڵت دەنێن بۆ رووبەڕووبونەوەی ئاستەنگەکان و، هێزت دەدەنێ بۆئەوەی بۆ رووبەڕووبونەوەیان ئامادەبیت.

## گرنگترین رێگاکانی هاندانی کەسانی تر:

١- زیادکردنی متمانەبوون بەخۆیان و کەسانی تر.

٢- یارمەتیدانیان لە دانانی ئامانجەکانیان و، لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی.

٣- ئاشناکردنیان بە نمونەی کەسانی سەرکەوتوو.

٤- دانانی پلانی ئایندەیی بۆ ئامانجەکان و راهێنانیان لەسەری.

٥- پاڵپشتی مەعنەوی و دانان بە دەستکەوتەکانیاندا.

٦- هاندانیان لەسەر رەخنەی ئەرێنی و دەستپێشخەریکردن.

# ئامانج (الهدف)

گەنجێك هەبوو، كوڕی پیاوێكبوو ئەسپی بەخێودەكرد، بەردەوام لە جێگۆڕیندابوو، ئەوەش كاریگەری خراپی كردە سەر داهاتووی خوێندنی كوڕەكەی، ڕۆژێكیان مامۆستای قوتابخانەی داوای لێكرد خەونی كاتی گەورەبوونی خۆیی بۆ بنوسێت، ئەوەبوو لە (٧) لاپەڕەدا خەونەكەی خۆیی نوسی، كە بریتیبوو لەوەی كێڵگەیەكی گەورەی بەخێوكردنی ئەسپی هەبێت، پانتاییەكەی (٢١٠٠٠)مەتربێت و، لەناوەڕاستەكەیدا خانویەكی (٤٠٠٠) مەتر چوارگۆشەیی هەبێت. ئەوەندە بەوردی خەونەكەیی نوسیبو، تەنانەت هێڵكاریی كێڵگەكەشی كێشابوو شوێنی باڵەخانەو گەوڕو یاریگاكەشی تیادا دیاری كردبوو، زۆر وابەستەی ئەو پرۆژەیەبوو، دوای دووڕۆژ لە تەسلیمكردنی خەونەكەی بەمامۆستاكەی، بۆی گێڕایەوە، بەڵام لە لاپەڕەی یەكەمدا بەگەورەیی پیتی (F) نوسرابوو لەگەڵ تێبینیەكەدا كە بریتیبوو لە: دوای تەواوبوونی دەوام وەرە بۆلام، دوای دەوام گەنجی خاوەن خەون ڕۆشت بۆلای مامۆستاكەی و لێی پرسی: مامۆستا بۆ (F)م بەدەستهێناوە؟ مامۆستاكەی وەڵامی دایەوە: ئەوە خەونێكی ناواقعیە بۆ گەنجێكی وەك تۆ، چونكە تۆ هیچ پارەیەكت نییە و، خێزانەكەشت بێلانەو خانەن، بوون بەخاوەنی كێڵگەیەكی گەورەی بەخێوكردنی ئەسپیش پێویستی بەپارەیەكی زۆر هەیە، لەبەرئەوە بۆ بەدیهێنانی ئەو خەونە هیچ ڕێگایەكت لەبەردەمدا نییە، بۆیە پێی وت: ئەگەر سەرلەنوێ خەونەكەتت نوسیەوەو ئامانجێكی واقعیت هەڵبژارد، ئەوە چاوێك بە نمرەكەتدا دەخشێنمەوە، گەنجەكە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو، ماوەیەكی زۆر بیری لەقسەی مامۆستاكەی كردەوە، دواتر لەباوكی پرسی: چیبكەم؟ وەڵامی دایەوە: كوڕی خۆم بڕیار لەدەستی خۆتدایە، خۆت تاكە كەسیت دەتوانیت ئەو وێنەیە بگۆڕیت و بارودۆخێكی تازە بێنیتە گۆڕێ، دوای هەفتەیەك لە بیركردنەوە، گەنجەكە بەبێ هیچ دەستكاری كردنێك هەمان كاغەزی پێشووی بردەوە بۆ مامۆستاكەی و، لەسەری نووسی: دەتوانیت ئەمجارەش (F)م بۆ دانێیت، منیش دەست بەخەونەكەی خۆمەوە دەگرم، بەمجۆرەو دوای تێپەڕینی چەند ساڵێك، مامۆستاكەی بانگكرد بۆ سەردانی كێڵگەكەی، كە پانتاییەكەی (٢١٠٠٠) مەتربوو، لەناوەڕاستەكەشیدا خانوویەكی (٤٠٠٠)مەتر چوارگۆشەیی هەبوو، مامۆستاكە تەماشای كرد خاوەنی كێڵگەكە هەمان ئەو قوتابیەی خۆیەتی كە خەونەكەی هەبوو، كاغەزیی خەونەكەشی بەناوەڕاستی هۆڵی خانوەكەیدا هەڵواسیوە!! مامۆستاكە بەرلەوەی كێڵگەكە جێ بهێڵێت بەخاوەنی كێڵگەكەی وت: ئێستا دەتوانم پێت بڵێم: كاتێك مامۆستابووم، خەونی ژمارەیەكی زۆر قوتابیم دزی، بەڵام تۆ ئەوەندە زیرەك

بویــت دەســتت بەخەونەکانتــەوە گــرت و، توانیــت بارودۆخێــکی نــوێ بێنیتەگــۆڕێ.

## ئێستا با لێت بپرسم

گونجاوە کەسـێك کە هەموو پارەکانی لەپرۆژەیەکی شکسـتخواردوودا لەدەسـتدابێت، بێـت و بڵێـت: ئەگـەر مـن خـاوەنی ئـەو پرۆژەیـە بوومایـە باشـترین بارودۆخـم دەبوو، ئومێدێـکی گەورەم بـەو پرۆژەیـە هەبوو!.

یاخـود ئافرەتێـك لە کۆچـی دوایی دایکیـدا بڵێت: هەرگیـز وەك جاران نابـم، هەرگیز وەك ئەمڕۆ خۆشـیم لەژیـان نەبینیوە!!

کێشــەکە لێــرەدا ئەوەیــە، هەمــوو ئەوکەســانە بەئاڕاســتەیەکی هەڵــەدا دەڕۆن! چارەســەرەکەش زۆر بەئاســانی بریتیــە لــە گۆڕینــی ڕێگاکــە، لەبەرئــەوەی ئەگەر لەســەر هەمــان ڕێــگا لەڕۆیشــتن بەردەوامبیت، ئــەوە لە تراویلکــەی بیاباندا وندەبیــت و، جگە لە شکســت و بێئومێــدی و دامــاوی هیچــی تر نابینیت، هیچ شــتێکی تیــادا نابینیت خزمەت بــە ئامانجــەکانی ژیانــت بکات.

> **«ئەگەر بەردەوامبیت لەسەر دووبارەکردنەوەی هەمان شت، ئەوە هەمان ئەنجامت دەست دەکەوێتەوە» پەندێکی چینی**

لەبەرئــەوە دوورکەوەرەوە لەو ڕێگایەی خزمەتی مەبەســتەکەت نــاکات، دوورکەوەرەوە لــەو ڕێگایــەی دوورت دەخاتــەوە لــە هێنانــەدی ئامانجەکــەت، هــەر ئێستا بڕیــار بــدە ڕێگاکــە هەڵبژێــرەو، دەســت بکــە بەکــردار و، پشــت بەخــوای گــەورە ببەســتە، ئــەو لەو ڕێگایــەدا لەگەڵــت دەبێــت و بــەرەو ڕێــگا دروســتەکە ڕێنماییــت دەکات.

ڕێگایــەکی تــر بگرەبەر، تەماشــای پێشــەوەت بکــەو ئاوڕ بــۆدواوە مــەدەرەوە، پابەندی ئامانجەکــەت بــەو لەشــێوازی جێبەجێکردنەکەیــدا مرونەتــت هەبێــت، بەویســتی خــوای گــەورە دەبینیــت دەرگا تازەکــە بەکراوەیی لەســەر پشــتەو چاوەڕێــت دەکات.

ژیانی بێئامانج شایانی ئەوە نییە بۆی بژین

ئەلبێرت ئەنیشتاین ئەم قسەیەی بەو دکتۆرە وت کە چەند خولەکێك بەر لەمردنی خەریکی چارەسەرکردنی بوو، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە مانای ئەو رستەیە بۆمان دەردەکەوێت چی فەلسەفەیەکی قوڵی تیادایە، لەبەرئەوەی ئەو ژیانەی هەر مرۆڤێك هەیەتی و بەبێ ئامانج دەیباتە سەر، هیچ مانایەکی نییەو لەسێبەری کەسانی تردا دەژی.

## جۆرەکانی ئامانج بەگوێرەی گشتگیریان:

١- **ئامانجـی گشـتی:** بریتیـە لەچەنـد دەسـتەواژەیەکی گشـتی و، دەربـڕی ئـارەزوو یـان نیـەت یـان قەناعەتێـکی تیۆریـە (خەونـەکان).

٢- **ئامانجـی قۆناغبەنـدی (مرحلـی):** کۆمەڵێـك دەسـتەواژەن لەئامانجـی گشـتی دیاریکراوتـرن، هەنـگاوەکانی قۆناغێـکی دیاریکـراوی پـلان ڕوندەکاتـەوە، یاخـود کارێـکی گرنگـی پەیوەسـتە بـەکات و شـوێنەوە، بـۆ هێنانـەدی ئامانجـە گشـتیەکان.

٣- **ئامانجـی رێـکاری (إجرائـی):** رێوشـوێنی کرداریـن، دەکرێـت دیـاری بکرێـت و، ئەنجـام بدرێـت و، تێبینـی بکرێـت و، پێوانـە بکرێـت.

## جۆرەکانی ئامانج بەگوێرەی دابەشکردنی کات:

- **ئامانجـی دوورمـەودا:** لـە ٥ سـاڵ و زیاتـر، هەمـان ئامانجی سـتراتیجیە، کـە زۆربەی جـار ماوەکـەی یەکسـانە بـە مـاوەی تەرخانکـراو بـۆ هێنانـەدی دیدگا.
- **ئامانجـی مـەودا مامناوەند:** لە سـاڵێك بۆ پێنج سـاڵ، ماوەکەی نیـوەی ماوەی ئامانجی ستراتیجیە.
- **ئامانجـی کـورت مـەودا:** لەسـاڵێك تێناپەڕێـت، جـا مـاوەی ئامانجـە سـتراتیجیەکە هەرچەندبێـت.

## رێگا کردارییەکانی داڕشتنی دیدگاو پەیام و ئامانج

سـتراتیجیەتێکی تاقیکـراوەی زۆر جـوان هەیـە بۆ پەرەپێـدانی خەونەکانـت و گۆڕینی بـۆ دەرفەتی راسـتەقینە:

تەکنیکـی زەین گوشـین بەکاربهێنە بۆ سـەرنجدان و بیرکردنـەوەو دۆزینەوەی بیرۆکەی تـازە، هـەر بیرۆکەیـەك دەبـووە هـۆی بەرهەمهێنـانی سـەرکەوتن و دەرفـەت دەسـتبەجێ بینوسـە، گـوێ مـەدە بـەوەی سـەرەتا وەك بیرۆکەیـەکی بێسـوود بێتـە پێشـچاو، یاخود بەدیهێنـانی قـورس بێتـە بەرچـاو، تەنها بیان نووسـە.

دواتـر بـەوردی لەهەریـەك لەو بیرۆکانـە بکۆڵەرەوە، بایەخی پێویسـتیان پێبـدە، چونکە رێـی تێدەچێـت یەکێـك لـەو بیرۆکانـە زۆر بەرهەمداربـن، شـوێن هەسـتەکانت بکـەوە، بـەڵام با کۆنترۆڵـی پرۆسـەی بڕیاردانـت نەکات.

جارێکی تر پرۆسەی زەینگوشین ئەنجام بدەرەوە، بۆئەوەی جار لەدوای جار بیرۆکەی نوێ بەرهەم بێنیت.

## هەنگاوی یەکەم: دیاریکردنی خەون و خولیاکان:

١- هەموو ئارەزوو خەونەکانت بهێنەرەوە بیری خۆت.

٢- لە خەیاڵی خۆتدا پەرەیان پێبدە و ئاست و قەبارەو بەهایان بەرز بکەرەوە.

٣- مەپرسە چۆن، تەنها ڕێگا بدە بە پێنووسەکەت بنوسێت.

٤- لەوکاتەی بیرکردنەوەت نوقمی ناو خەونەکانت بووە بەردەوامبە لەنووسین.

٥- بزانە کە سەرەتای ڕاستیی و دەستکەوت بە خەون دەستپێدەکات.

٦- مادام دەتوانیت خەون ببینیت، کەواتە شتێك بەناوی ئەستەم نییە.

٧- لەوانەیە زیاد لە ١٠٠ خەون یان ئارەزوو بنووسیت، گوێ بەژمارە مەدەو هەمووی لەم خشتەیەدا بنووسە:

| | |
|---|---|
| ١ | |
| ٢ | |
| ٣ | |
| ٤ | |
| ٥ | |
| ٦ | |
| ٧ | |
| ٨ | |
| ٩ | |
| ١٠ | |
| ١١ | |
| ١٢ | |
| ١٣ | |
| ١٤ | |
| ١٥ | |

وریای خەون دزەکان بە، ئەوانەی ئاسان قورس دەکەن و، مێشێك دەکەنە گایەك

## هەنگاوی دووەم: ڕاگرتنی هاوسەنگی لەنێوان لایەنە جیاوازەکانی ژیاندا

### چیرۆکی داناو گەنجەکە

دەگێڕنەوە بازرگانێك کوڕەکەیی نارد بۆلای داناترین پیاوی جیهان، بۆئەوەی فێری نهێنی بەختەوەری ببێت...

کوڕەکە ٤٠ ڕۆژ ڕێی کرد، هەتاوەکو گەشتە کۆشکێکی جوان کە لەسەر لوتکەی شاخێك بوو، ئەو پیاوە دانایەی بەدوایدا دەگەڕا لەو کۆشکەدا دەژیا، کاتێك گەشتە کۆشکەکە بینی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی لێیە، بۆیە دوو کاتژمێر چاوەڕێی کرد هەتاوەکو نۆبەی چوونە ژوورەوەی هات، کاتێك چووە ژوورەوە دەستی کرد بەقسەو، داناکەش بەوردی گوێی بۆ قسەکانی گرتبوو، پاشان کابرای دانا پێی وت: ئێستا کاتم نییەو بڕۆ پیاسەیەك بەناو کۆشکەکەدا بکەو دوای دوو کاتژمێری تر وەرەوە بۆلام، بەڵام بەرلەوەی بڕوات پیاوەی دانا کەوچکێکی بچووکی دایە دەست کوڕەکە، کە دوو دڵۆپ ڕۆنی تیادابوو پێی وت: لەو ماوەیەی بەناو کۆشکەکەدا دەگەڕێیت با ئەم کەوچکەشت پێبێت، بەڵام وریابە هیچ لە ڕۆنەکە نەڕژێت.

کوڕەکەش دەستی کرد بەگەڕان بەناو کۆشکەکەداو، لەهەموو بەرزونزمیەکانی ناو کۆشکەکەدا چاوی لەسەر کەوچکەکەبوو، بۆئەوەی ڕۆنەکە نەڕژێت، پاشان گەڕایەوە بۆلای داناکە.

کابرای دانا پێی وت: فەرشە فارسیەکەت بینی کە لەچێشتخانەکەدا ڕاخرابوو؟ باخچە جوانەکەت بینی؟ پەڕتووکە جوانەکانی ناو پەڕتوکخانەکەم سەرنجیان ڕاکێشایت؟

کوڕەکە شڵەژاو پێی وت کەوا هیچی نەبینیوە، چونکە خەمی یەکەم و کۆتایی ئەو ئەوەبووە دڵۆپە ڕۆنەکان نەڕژێن.

داناکە پێی وت: بگەڕێرەوەو تەماشای دیمەن و جێگا سەرنجڕاکێشەکانی کۆشکەکە بکە، چونکە ناتوانیت پشت بەقسەی کەسێك ببەستیت شارەزای خانوەکەی نەبیت،

ئەوەبوو کوڕەکە بەکەوچکە ڕۆنەکەوە گەڕایەوەو سەرنجی دیمەنی جوان و پڕ لەهونەری سەر دیوارەکانی دەدا، ئەمجارە باخچەو گوڵە جوانەکانی بینی، کاتێك گەڕایەوە بۆلای داناکە، هەموو ئەوانەی بینیبوونی بەوردی بۆ کابرای دانای گێڕایەوە.

داناکە لێی پرسی: ئەی ڕۆنی ناو کەوچکەکە کوا؟

کوڕەکە تەماشای کەوچکەکەی کرد بینی ڕۆنەکە ڕژاوە، بۆیە داناکە پێی وت: ئەمە ئەو ئامۆژگاریەیە کە دەتوانم پێشکەشتی بکەم: نهێنی بەختەوەری ئەوەیە جوانیەکانی دونیا ببینیت و چێژی لێ ببینیت، بەبێ ئەوەی دوو دڵۆپە ڕۆنەکە بڕژێت.

کوڕەکە لە مەبەستەکە تێگەیشت... بۆی دەرکەوت بەختەوەری بریتیە لە ئەنجامی هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوان شتەکاندا.

## هەنگاوی سێیەم: ڕەخنەگرتن لە خەونەکان و، گۆڕینیان بۆ ئامانجی ستراتیجی

١- هەستە بە هەڵسەنگاندنی ئەو خەونانەی پێشتر نوسیوتن و، پاشان بیانگۆڕە بۆ دیدگا یان ئامانج، با ڕەخنەکانت واقعی بن و، لەبەها و قەبارەی هیچ خەونێکی نوسراوت کەم مەکەرەوە و، ڕێسای (رفق: رغبە، فرصە، قدرە) پەیڕەو بکە.

- ئارەزوو (رغبە): لەبەرئەوەی ئەگەر ئارەزووت لەو خەونە هەبوو، ئەوە دەتوانیت بەرەنگاری ئەو ئاستەنگانە ببیتەوە کە دێنەڕێت.
- دەرفەت (فرصە): مەبەست لێی ئەوەیە: ئایا ئەو خەونەی نوسیوتە بازاڕ(دەرفەت) ی هەیە؟
- توانا(ق): ئایا هێزو تواناکانت یارمەتیت دەدەن ئەو خەونەت بێنیتەدی؟

٢- بزانە کە بەلانی کەمەوە نیوەی خەونەکان دێنەدی و، خەونەکانی ئەمڕۆ ڕاستیەکانی سبەینێن.

٣- جیاوازی نێوان خەون و دیدگا ئەوەیە کە دیدگا بەستراوە بە کاتێکی دیاریکراوەوە بەپێچەوانەی خەونەوە.

٤- بواری خەونەکەت دیاری بکە، بەجۆرێك لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت و لە ٥٠ ساڵ زیاتر نەبێت.

٥- پێویستە دیدگاکە بەگوێرەی بوارەکانی ژیان دابەش بکرێت، بۆئەوەی لایەنێکی گرنگمان بیرنەچێت.

٦- ئـەو بوارانـەی تریشـی بۆ زیاد بکە کە هەسـت دەکەیـت لە داهاتـوودا دەبێت بایەخی پێبدرێت.

٧- ئاسـۆی بیـرو زانیاریـت فـراوان بکـە بـۆ نوسـینی ئـەو ئامانجانـەی تـر کـە لەوانەیـە پێشـتر بیـرت چووبێـت بیـان نووسـیت.

خەونی گەورەکان خێراتر لە خەونی بچووکەکان دێتەدی.

| | لایەنی رۆحی |
|---|---|
| ١ | |
| ٢ | |
| ٣ | |

| | لایەنی کەسی |
|---|---|
| ١ | |
| ٢ | |
| ٣ | |

| | لایەنی خێزانی |
|---|---|
| ١ | |
| ٢ | |
| ٣ | |

| | لایەنی کۆمەڵایەتی |
|---|---|
| ١ | |
| ٢ | |
| ٣ | |

## هەنگاوی سێیەم: داڕشتنی دیدگاو پەیام و ئامانج

### یەکەم: داڕشتنی دیدگا (الرؤية)

ئەگەر بەڕوونی دیدگاکەت بنوسیت، ئەوە دەتوانیت بەباشی تەرکیز بخەیتە سەر ئەوشتەی دەتەوێت بیهێنیتەدی و، وەك ئەو بناغەیەی لێدێت کە ئامانجەکانتی لەسەر بونیاد دەنێیت، هەتا دیدگاکەت گرنگتربێت ئارەزووەکانت زیاتر دەبن و، پاڵنەرەکانت زیاتر دەتجولێنن بەرەو ئەنجامدانی ئەرکەکانت، و باشتر لەوە تێدەگەیت تۆ کەسێکی بەهێزترو بەتواناترو زیرەکتر لەوەیت کە خەونت پێوە دەبینی و گومانت دەبرد، هەروەها توانای پابەندبوون و قوربانی دانت هەیە لەپێناو بەخشینی مانا بەژیانت، دیدگا دەتکاتە خاوەنی ئەو متمانەیەی بۆ ئەنجامدانی کردەوەی ئەرێنی بەردەوام پێویستت پێیەتی، هەنگاوی یەکەم و بنەڕەتییش ئەوەیە دیدگاکەت لە مێشکتدا جێگیر بکەیت و، بەوجۆرە بیبینیت کە هاتۆتەدی، ئەمەش دەتکاتە خاوەنی ڕێ و ڕێبازێکی روون بۆ دانانی پلان و هێنانەدی ئەو ئەنجامانەی دەتەوێت.

### مەرجەکانی دیدگا:

١- بە دەمی رانەبردوو دابڕێژرێت، کە بەڵگەی دەستکەوتە نەك هۆکار.

٢- تایبەت بێت بەخۆت و، خۆت لە بەدیهێنانی بەرپرسیاربیت و، خزمەتی خۆت بکات.

٣- پێویستە بەشێوەیەکی کورت و پوخت و روون دیدگاکەت داڕێژیت (٨ - ١٤) وشەبێت.

٤- ماوەیەکی دیاریکراو هەبێت بۆ بەدیهێنانی، لە ٣ ساڵ کەمتر نەبێت و لە ٢٠ ساڵ زیاتر نەبێت (٣ ساڵ یان ٥ ساڵ یان ٧ ساڵ یان ١٠ ساڵ).

٥- واقعی بێت و قابیلی ژماردن یان پێوانەکردن بێت.

٦- ئەگەر بەناڕاستەوخۆش بێت، پێویستە گرنگترین بوارەکانی ژیان لەخۆ بگرێت.

٧- دەبێت نوسراوبێت.

دیدگا ئەوەیە: خۆت لە داهاتوودا ببینیت هەموو ئەوشتانەی دەتەوێت، بەشێوەیەکی هاوسەنگ بەدیت هێناون.

یاخود بریتیە لە: وێنەیەکی زەینی پرشنگدار بۆ داهاتوویەکی باشتر.

## دارشتنی بەشەکانی دیدگا لەهەموو بوارەکانی ژیان

| بوار | بەشەکانی دیدگا بۆ هەر بوارێك |
|---|---|
| کەسی | |
| زانستی | |
| پیشەیی | |
| مادی | |
| ..... | |

## دیدگای هێڵی ئاسمانی بەریتانی

ببینە باشترین و سەرکەوتووترین کۆمپانیا لەجیهانی دروستکردنی فرۆکەوانی شارستانی.

## دیدگاکەم بۆ ساڵی (٢٠٢٠ - ٢٠٢٥)

ببمە ڕاهێنەرو ڕاوێژکارێکی جیهانی جیاواز، بۆ پەرەپێدان و بەختەوەرکردنی خۆم و کەسانی دیکە.

ئێستا بە دارشتنێکی جوان و گونجاو، تۆش هەستە بە دارشتنی دیدگاکەت بۆ ساڵی ٢٠٢٠ - ٢٠ .

### دووەم: پەیام (الرسالة)

ئەو ئەرکە سەرەکیەیە کە لەژیاندا بۆ خۆتی هەڵدەبژێریت.

ئەو مەبەستەیە کە لەپێناویدا دەژیت.

دوای ئەوەی هەستایت بەدانانی دیگاکەت، ئێستا دەتوانیت پەیامەکەت دیاری بکەیت.

بەرلەوەی دەست پێبکەیت، پێویستە جیاوازی نێوان دیدگاو پەیام بزانیت:

| پەیام | دیدگا |
|---|---|
| • پەیوەست نییە بە ئامانجێکی دیاریکراوەوە، دەستکەوتەکەی گشتییە و بۆ کەسانی دیکەیە.<br>• ئاڕاستەیە و ناژمێردرێت.<br>• مەبەستە (بەختەوەری و ڕەزامەندی).<br>• هەستی پێدەکرێت.<br>• گشتیەو دەمێنێتەوە. | • مەبەست و ئامانجێکە پێی دەگەیت و، دەستکەوتەکەشی تایبەتە بەخۆت و، بە میرات بۆ کەسانی تر نامێنێتەوە.<br>• ئەنجامەکەی پێوانە دەکرێت و دەژمێردرێت.<br>• هۆکارە (سەرکەوتن و جیاوازبوون). |

## لە دیدگاو پەیامدا خەڵك چوارجۆرن:

١- **پەیام و دیدگا:** ئاڕاستەی خۆیان دەزانن و، ئامانجی روونیشیان هەیە.

٢- **پەیام بەبێ دیدگا:** ئاڕاستەی خۆیان دەزانن، بەڵام پلانی نوسراویان نییە.

٣- **دیدگای بێ پەیام:** دەزانن چیان دەوێت، بەڵام ئاڕاستەی ژیانیان دیاری نەکردووە.

٤- **نە پەیام نە دیدگایان نییە:** نە لەژیاندا ئاڕاستەی خۆیان دەزانن و، نە دەشزانن چیان دەوێت.

## مەرجەکانی ئامادەکردن و داڕشتنی پەیام:

بۆ داڕشتنی پەیام پێویستە وای لێبکەین ئاسان و گشتگیربێت و چەند بوارێکی ژیان بگرێتەوە، هەروەها بەهاکانیشی تێدابێت (بەگوێرەی ئەو ریزبەندییەی لەپێشەوە بۆ بەهاکانت کردووە)، پەیامەکەت دەبێت ئەم مەرجانەی تێدابێت:

١- هۆکاربێت و، بەدیاریکراوی ئاڕاستەی رۆشتنت بۆ دیاری بکات.

٢- جیاوازیت پێ ببەخشێت و، بەردەوامی بدات بە ژیانت.

٣- لەسەر شێوازی چاووگ دابڕێژرێت و، مانای دیدگاکەتی تێدابێت.

٤- هاندان و پاڵنەرو رووناکیت بداتێ، بۆئەوەی ژیانت بگۆڕیت.

٥- مرونەتی تێدابێت و، بۆماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، هەروەها بەجۆرێك بێت شیاوی پەرەپێدان بێت.

٦- بەرزترین ئەو بەها باڵایانەی تێدابێت، کە لە ئەنجامدانی پەیامەکەتدا پابەندیان دەبیت.

٧- دڵنیابیت لەوەی پەیامەکەت زۆربەی بەشەکانی دیدگاکەتی تێدایە.

٨- بوارە سەرەکیەکانی ژیانتی روون کردبێتەوە.

**نمونەی خشتەیەکی بەشەکانی دیدگا، بۆ دیاریکردنی بەشەکانی پەیام**

| بوار | بەشی دیدگا | ئامانج یان دەستکەتی کەسی | مەبەستی باڵا (دەرەکیەو بۆکەسانی ترە) | بەشەکانی پەیامەکە و بەها باڵاکان |
|---|---|---|---|---|
| کەسی | ئەنجامدانی کاروبارەکان | پەرەپێدانی خود | دەستکەوت بۆ کەسانی دیکە | دەستکەوتی ناوازە |
| زانستی | خوێندنەوەی پەرتووك | جیاوازبونی پیشەیی | بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری | شارەزایی زانستی |
| پیشەیی | راهێنەرو راوێژکار | بەدیهێنانی دەستکەوتی دارایی | پێویستیەکانی کەسانی دیکە | کواڵێتی راهێنان |
| دارایی | خانویەك بکرم | ئاساییشی خێزانی | یارمەتیدانی کەسانی دیکە | پێشکەوتن |
| کۆمەڵایەتی | پەیوەندی کۆمەڵایەتی | حەوانەوەی دەروونی | هۆگری و هاوکاری | بەختەوەری |

## داڕشتنی پەیام لەبەشەکانی دیدگاو بەهاکانەوە

## پەیامی هێڵی ئاسمانی بەریتانی

دابینکردنی خزمەتگوزاری کواڵێتی بەرز و، نرخێکی گونجاو بۆ کڕیارەکانمان، لەهەموو کەرتێکی بازاڕ کە تیایدا رکابەری کەسانی تر دەکەین.

## پەیامەکەم

ئەنجامدانی راهێنانێکی جیاوازی زانستی ورد بۆ خۆم و کەسانی دیکە، بە راستگۆیی و بەپێی پێوەرە جیهانیەکان، بۆئەوەی لە هەردوو دونیادا پێشکەوین و بەختەوەربین.

## ئێستا تۆش پەیامەکەی خۆت بنووسە:

....................................................................................

....................................................................................

## دیدگاو پەیام و هاوسەنگی ناوخۆیی

**بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی هاوسەنگی تەواو لەگەڵ پەیامەکەدا، دەکرێت پەیڕەوی ئەم هەنگاوانە بکەین:**

١- بەم پرسیارانەی خوارەوە دەست پێبکە و، هەستەکانت تیژو بەهێز بکەرەوە، لەکاتی پەسەندکردنی پەیامەکەدا هەست و وەڵامێکت بۆ دێت کە پاڵپشتی پەیامەکەت دەکات و قبوڵی دەکات، ئەگەر هاتوو ئەندامێك رەخنەی لێگرتیت و وتی: تۆ بۆچی ئەم پەیامەت هەڵبژاردووە بۆ ژیانت؟ لەم کاتەدا بێدەنگبە، چونکە هەموو رەخنەیەك زانیاریی گرنگی تێدایە لەبارەی ئەوەی کە دەبێت پەیامەکەت چۆنبێت؟ بۆیە گوێی بۆ بگرەو رێزیشی لێبگرە، هەندێك پرسیاریش هەن دەتوانیت لەخۆتی بکەیت:

- ئەم پەیامە چۆن لەگەڵ دین و بەرپرسیارێتیەکانمدا دەگونجێت؟
- ئەم پەیامە چۆن لەگەڵ ژیانی زانستی و پیشەییمدا دەگونجێت؟
- ئەم پەیامە چۆن لەگەڵ ژیانی خێزانی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانمدا دەگونجێت؟
- ئەم پەیامە چۆن لەگەڵ کاروباری ژیانی ئێستاو داهاتوومدا دەگونجێت؟

٢- ئەگەر هەر نارەزایەتیەکی ناوخۆیی هەبوو لەبارەی هەریەك لەو پرسیارانەوە، ئەوە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو ئەندامەی تیمەکەتدا بکە، بەوەی: رێزی بگرەو، بەوپەڕی رێزەوە گوێ بگرەو وەڵام بدەرەوە» بەم شێوەیە:

- گوێ بگرەو بچۆ بەدەم رەخنەکەوە، چونکە ئەو رەخنەیە زۆر سوودی هەیە بۆ راگرتنی هاوسەنگی لەگەڵ پەیامەکەتدا.
- نیەتی ئەرێنی ئەو ئەندامە ناوخۆییەت بزانەو، دواتر بە شێوەیەکی ئەرێنی رێزی لێبگرەو بیدوێنە.
- پەیوەندی بە ئەندامە داهێنەرەکەتەوە بکەو، داوای لێبکە زۆرترین ژمارەی جێگرەوەت بداتێ.

- جێگـرەوەکان بـۆ ئـەو ئەندامـەت بخـەرە ڕوو، داوای لێبکـە بـەلانی کەمەوە سـێ جێگرەوەیـان هەڵبژێرێـت، ئەگـەر رازی بوو سوپاسـی بکەو، پاشـان جێگرەوەکان بـۆ ئەندامـەکانی دیکـە بخـەرەڕوو بزانە هیـچ نارەزاییـەك هەیە، جا ئەگـەر هەموان رازی بـوون سوپاسـیان بکـە، ئەگـەر نارەزاییش هەبـوو، بزانە چییـە و ئینجا لەگەڵ ئـەو ئەندامـەدا گەڕێکی نوێی دانوسـتان دەسـت پێبکە.

٣- دوای ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکان، پەیامەکەت بخەرەڕوو سوپاسی هەمووان بکە.

٤- دۆزینەوەی شـێوازەکانی پاڵپشـتی، وەك دەبینیت پەیامەکەت بەناو شـوێن و کاتیشـدا بڵاوبووەتـەوە، لەخـۆت بپرسـە: ئـەم پەیامە چۆن چـۆنی بۆ من باشـدەبێت؟

- ئەم پەیامە چۆن رەنگدانەوەی دەبێت لە خۆمدا؟
- ئەم پەیامە چۆن رەنگدانەوەی دەبێت لەسەر ئەوکەسانەی من بایەخیان پێدەدەم؟
- بوونم مانای چییە؟
- ئایا ژیانکردن بەگەرموگوڕی و خۆشەویسـتیەوە لەسـەر ئەم پەیامە پیرۆزە، سـودی هەیە بۆ دونیـاو دوارۆژم؟

بەردەوامبـە لەسـەر کـردنی ئـەم جـۆرە پرسـیارانە، هەتـا وات لێدێـت هەسـت بـە هاوسـەنگی و گونجـاوی تەواودەکەیـت و، گوێـت لـە ناخـی خۆتـە دەڵێـت: بەڵـێ... ئـەوە پەیامەکەمـە.

**ئەگەر دڵنیانەبیت لەوەی بەرەو کوێ دەچیت، ئەوە سەرت لەشوێنێکەوە دەردەچێت کە ئەو شوێنە نییە ویستووتە بۆی بچیت.**

## دیدگاو پەیام و تەکنیکی «ئاستە لۆجیکیەکان»

### هەنگاوی یەکەم:

١- شـوێنێکی ئـارام و بێدەنـگ بـدۆزەرەوە، کـە بۆمـاوەی ٣٠ خولـەك کـەس بێـزارت نـەکات.

٢- هێمن و ئارام بە.

٣- شـەش کاغـەز بێنـەو لەسـەر هـەر یەکێکیـان یەکێـك لـەو وشـانەی نـاو خشـتەکەی خـوارەوە بنووسـە کـە ئامـاژەن بـۆ «ئاسـتە لۆجیکیـەکان»:

| ٦- پەیوەندیەکان | ٥- ناسنامە | ٤- بەهاو باوەڕەکان | ٣- تواناکان | ٢- رەفتار | ١- ژینگە |
|---|---|---|---|---|---|

## هەنگاوی دووەم:

دیدگاو پەیامەکەت دیاری بکەو، پاشان ئەم شتانە دیاری بکە:

١- **ژینگە:** لەسەر کاغەزی ژینگە بوەستەو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: کەی و لەکوێ دەمەوێت رەفتار بکەم وەك ئەوەی من (.....)، دیدگاو پەیامی پێویست دیاری بکە، وەك ئەوەی بەدی هاتبێت.

کاتی خۆت وەرگرەو، هەتا ئەوکاتەی ئەوە دەبینیت کە دەیبینیت و، ئەوە دەبیستیت کە دەیبیستیت و، ئەوە هەست پێدەکەیت کە هەستی پێدەکەیت.

٢- **رەفتار:** ئێستا بڕۆرە سەر کاغەزی رەفتارو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: ئەو کارو رەفتارە چییە کە وەك (........) ئەنجامی دەدەم؟

٣- **تواناکان:** بچۆرە سەر کاغەزی تواناکان و وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: ئەو توانایانە چین تیامدایەو پێویستم پێیانە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە؟

٤- **بەهاو باوەڕەکان:** ئێستا بچۆرە سەر کاغەزی بەهاو باوەڕەکان و وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: بۆ ئەم کارە ئەنجام دەدەم؟ بۆچی ئەم توانایانەم دەخەمە کار؟ کامانەن ئەو بەهاو باوەڕە گرنگانەم کاتێك بەم کارە هەڵدەستم؟

٥- **ناسنامە:** ئێستا بچۆرە سەر کاغەزی ناسنامەو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: من کێم وەك (...........)؟ من چی جۆرێك لە (.............)م؟

٦- **پەیوەندیەکان:** بچۆ بۆلای کاغەزی پەیوەندییەکان و وەڵامی ئەم پرسیارە بدەرەوە: من لەگەڵ کێدا وەك (..............) کاردەکەم؟

بەتەواوی کاتی خۆت وەرگرە، هەتا ئەوکاتەی ئەوە دەبینیت کە دەیبینیت و، ئەوە دەبیستیت کە دەیبیستیت و، ئەوە هەست پێدەکەیت کە هەستی پێدەکەیت.

## هەنگاوی سێیەم:

١- لە کاغەزی پەیوەندییەکانەوە بگەڕێرەوە بۆ سەر کاغەزی ناسنامە، ئەزمونی ناوخۆیی و جەستەییش لەگەڵ خۆت بەرە، جارێکی تر پرسیارەکانی ناسنامە لەخۆت بکەرەوەو بزانە تاچی رادەیەك ئاستی ئەو قۆناغەت گەشەی کردووە!

٢- ئەزمون و دۆخی ئێستای پەیام و دیدگاکەت بەرەو برۆ بۆ سەر کاغەزی بەها و

بـاوەڕەکان، جارێکی تر پرسـیارەکانی ناسـنامە لەخـۆت بکەرەوەو بزانە تـا چ رادەیەك ئاسـتی ئەو قۆناغەت گەشـەی کردووە!واتـە: بزانە هیچ پێشـکەوتنێك لە وەڵامەکەتدا بـەدی دەکەیت.

٣- ئەزمـون و دۆخـی ئێسـتای پەیـام و دیـدگا و بەهـاو باوەڕەکانـت بـەرەو بڕۆ بۆ سـەر کاغـەزی توانـاکان، جارێـکی دیکـە پرسیارەکانی ناسـنامە لەخـۆت بکـەرەوەو بزانە تـاچ رادەیەك ئاسـتی ئـەو قۆناغەت گەشـەی کردووە! واتـە: بزانە هیـچ پێشـکەوتنێك لـە وەڵامەکەتـدا بـەدی دەکەیت.

٤- ئەزمـون و دۆخـی ئێسـتای پەیـام و دیـدگا و بەهـاو بـاوەڕ و تواناکانت بـەرەو بڕۆ بۆ سـەر کاغەزی رەفتـار، جارێکی دیکە پرسـیارەکانی ناسـنامە لەخۆت بکـەرەوەو بزانە تـا چ رادەیەك ئاسـتی ئەو قۆناغەت گەشـەی کـردووە! واتە: بزانە هیچ پێشـکەوتنێك لـە وەڵامەکەتدا بـەدی دەکەیت.

٥- هەمـوو ئەم ئاسـتانەی لەسـەرەوە باسـمان کرد بـەرە و بڕۆ بۆسـەر کاغـەزی ژینگەو، جارێـکی دیکـە پرسـیارەکانی ناسـنامە لەخۆت بکـەرەوەو، بزانە تا چ رادەیەك ئاسـتی ئـەو قۆناغـەت گەشـەی کـردووە! واتـە: بزانـە هیـچ پێشـکەوتنێك لـە وەڵامەکەتـدا بـەدی دەکەیت.

٦- ئـەو وێنـە یان دەنـگ یان هەسـتە یادی خـۆت بێنەرەوە کـە دۆخەکـەت بیردەخاتەوە، ئینجـا لەداهاتـوودا خـۆت ببینە کـە ئەوشـتەت بەدیهێناوە، پاشـان هەناسـەیەکی قوڵ هەڵمـژەو سوپاسـی خوای گـەورەی لەسـەر بکە.

**«ئەو تایبەتمەندییەی هەر دەبێت لە دیدگادا هەبێت، بریتیە لە جێبەجێکردن، نەك تەنها قابیلی جێبەجێکردن بێت».**

## سێیەم: ئامانج

روونی ئامانجـەکان یەکێکـە لـە پایـەکانی سـەرکەوتنی پـلانی کەسـی، دیـدگاو ئامانجـەکان وەك پلیکانـەکانی ئەو پەیژەیـە وان کە دەتبەن بەرەو سـەرکەوتن، پلاندانانیش وەك ئـەو بناغەیـە وایـە پەیژەکەی لەسـەر دانراوە، بەبـێ هەبوونی ئامانج دەرفـەتی بەردەم هێنانـەدی ئومێـدەکانی داهاتوویـەکی خـۆش و گەشـاوە لاوازدەبـن.

دیـدگا زانیـاری نمونەیـی دوور مـەودان، بـەڵام ئامانجـەکان زانیـاری ڕون و کورتـن سـەبارەت بـەو چالاکیانـەی دەویسـترێت لەماوەیـەکی دیاریکـراودا تـەواو بکرێـت،

رەنگـە مەبەست(غایە)یشـت ئەوەبێـت حـەز بکەیت کێشـت بۆ ئاسـتێکی دیـاری نەکراو دابەزێنیـت، لێـرەدا (ئامانجەکـە) دەبێـت بـە کەمکردنـەوەی سـێ کیلۆگـرام لـە کێشـت لەمـاوەی سـێ هەفتـەدا.

ئامانـج بەشـێکە لـەو دیدگایـەی لـە کۆمەڵێـك ئامانجـی کـورت مـەودا یـان مـەودا مامناوەنـد یـان دوورمـەودا پێکدێـت، ئامانجـەکان خزمـەتی دیـدگا دەکـەن و، دیدگاش ئـەو سـەرمایەیە کـە ژیانمـان ئاراسـتە دەکات.

ئامانجـەکان لەڕێـگای دیاریکردنی قەبـارەو ماوەو ژمـارە دەپێورێن، ئەمـەش وادەکات ئاسـان بێـت بڵێیـن: ئامانجەکانت بـەدی هێنـاوە یان نا.

خاڵـی سـەرەکی بریتیـە لـە تەرکیـز خسـتنە سـەر بیرۆکـەی ئامانجەکـە و، دیاریکردنی ئامانجێـکی گشـتی بـۆ هـەر کارێـك و، وردکردنـەوەی بـۆ کۆمەڵێـك ئامانجـی دیکـە، باسـکردنی مەبەسـت لە ئەنجامدانی هـەر کارێك بەرلە دەسـتپێکردنی، ئـەوەش بۆئەوەیە بەگوێـرەی ئـەو ئامانجانـە شـێوازی بەڕێوەچـوونی ئامانجـەکان کاروبـارەکان ئاراسـتە بکەیـن، بەبـێ زیـادو کەم.

کاتێك بەتەواوی دەزانیت ئامانجەکانت چین، ئیتر بەدیهێنانیان ئاسان دەبێت.

بەر لە هەر هەنگاوێك پێویستە ئامانجەکەت دیاری بکەیت: دەمەوێت بگەمە کوێ؟

**قدر لرجلك قبل الخطو موضعها**

**فمن علا زلقاً عن غرة زلجا**

**بەرلەوەی پێ هەڵبێنیت بزانە لەکوێدا دایان دەنێیت**

**هەرکەسێ بەشوێنی خلیسکاویدا بڕوات بەبێ ئاگایی دەکەوێت**

## مەرجەکانی ئامانجی ستراتیژی باش

١- بەڕێگایـەکی ئەرێنـی دابڕێژرێـت، فرمانی رانەبـردووی تێـدا بەکاربێـت ئاماژەبێت بۆ (بەرهـەم)ی کارەکـەو وەك (هـۆکار) دانەڕێژرێت.

٢- دیاریکراوو روونبێت و، لە ویست و قەناعەتێکی تەواوەوە سەرچاوەی گرتبێت.

٣- ئامانجێکی واقعی بێت و، شیاوی ئەوەبێت لەماوەیەکی دیاریکراودا بهێنرێتەدی.

٤- ریزبەندیی ئامانجەکان لەگەڵ ئەولەویاتەکانی دیدگاکەتدا گونجاوبێت.

٥- ئاراستەکراوبێت بەرەو باشکردن و پەرەپێدانی کاروبارەکان و، لە ئەنجام و دەرەنجامەکانەوە سەرچاوەی گرتبێت.
٦- گەورەترین دەستکەوتی کەسی لێ بێتە بەرهەم.
٧- هەندێك ئاستەنگیی تێدابێت و، ئەوە بگەیەنێت کە بەباشترین شێوە تواناکانی بەردەستت بەکاربهێنێت.
٨- تایبەت بێت بەخۆت و خۆت لە بەدیهێنانی بەرپرس بیت.
٩- دەبێت نوسراوبێت.

جگە لە دیاریکردنی دیدگاو پەیام، شتێکی دیکەش هەیە سەرکەوتنی پلانی کەسی پشتی پێدەبەستێت، بریتیە لە روونی ئامانجەکان و وردی ئەو رۆڵانەی بۆ خزمەتکردنی دیدگاکە ئەنجامیان دەدەین، کە ئەم ئامانجانە دەبێت شانبەشانی دیدگاکە برۆن.

بۆئەوەی بتوانیت پلانێکی ماوەدرێژ دابنێیت، پێویستە ماوەی پلانە ستراتیجیەکەت بەجۆرێك دیاری بکەیت لەگەڵ (تەمەن و تواناکان)تدا بگونجێت، چونکە مرۆڤ هەتاکو بچێتە تەمەنەوە ماوەی دیدگاکەی کەمدەکات و بەپێچەوانەشەوە، لەم خشتەیەی خوارەوەدا ماوەی دیدگاو تەمەنی گونجاو بۆ هەر ماوەیەك دیاری کراوە:

| دیاریکردنی ماوەی ئامانجە ستراتیجیەکە (دیدگا) بەجۆرێك لەگەڵ تەمەن و تواناکاندا بگونجێت | | | | |
|---|---|---|---|---|
| تەمەن بە ساڵ | رکابەری | جۆراوجۆر | گۆڕین | بەرگری |
| خوار ٢٠ ساڵ | ١٠ ساڵ | ٥ – ٧ ساڵ | ٣ – ٥ ساڵ | ٣ ساڵ |
| ٢٠ – ٤٠ ساڵ | ٧ ساڵ | ٣ – ٥ ساڵ | ٣ ساڵ | ١ – ٣ ساڵ |
| گەورەتر لە ٤٠ ساڵ | ٥ ساڵ | ٣ ساڵ | ٣ ساڵ | ١ – ٣ ساڵ |

## ئامانجی کورت مەودا

رەنگە دیدگا گەورەبێت و نەتوانین بەیەك جار هەمووی جێبەجێ بکەین، بەڵام ئەگەر بەش بەشمان کرد بۆ ئامانجی کورت مەودا، ئەوکات رەنگە ئاسان بێت، لەمکاتەدا ئامانجەکانی ساڵی یەکەم (١ – ٧٪)ی ئامانجە ستراتیجیەکانی ناو پلانەکەمان پێکدێنێت، ئێمە لەم نمونەیەی خوارەوەدا تەرکیزمان خستۆتە سەر یەك ئامانجی ستراتیجی، دواتر تەرکیز دەخەینە سەر ئامانجێکی مەودا مامناوەند، بۆیە

دەکرێـت ئامانجـەکانی سـاڵی یەکەمـی پرۆژەکـە بـەم جـۆرە دابنرێـت:

**ئامانجەکان لەو دیدگایەوە وەردەگرین کە پێشتر دامان نابوو (٢٠٢٠ - ٢٠٢٥):**

(ببمە راهێنـــەرو راوێژکارێکی جیهانی جیـــاواز، بۆ پەرەپێـــدان و بەختەوەرکردنی خۆم و کەســـانی دیکە)

لـەم دیدگایـەوە بۆمـان دەردەکەوێـت کۆمەڵێـك ئامانجـی گشـتی هـەن پێویسـتە بیانهێنینـەدی، دەکرێـت بشـکەڕێینەوە بۆ بوارەکانی هاوسـەنگی ژیان و، ئـەو ئامانجانەی لـێ هەڵبژێریـن کە لەگـەڵ دیدگاکەماندا دەگونجێت، ئەوەش لەسـەر بنەمـای ئەولەویاتە گرنگـەکان و رۆڵـەکانی ژیانمان:

١- بـەژداری بکـەم لـە دامەزرانـدنی ناوەندێـکی جیهـانی بۆ توێژینـەوەی گەشـەپێدان و بەڕێوەبـردن لەسـاڵی ٢٠٢٣.
٢- ٦٠ خـولی راهێنـان پێشـکەش بکـەم لەگـەڵ ٢٤ سـیمیناری جۆراوجـۆر بـۆ سـاڵی ٢٠٢١.
٣- خـۆم ئامـادە بکەم بۆ دەسـتکردن بـە نوسـینی پەرتووك یـان توێژینەوەیەکی زانسـتی، بـۆ بردنـەوەی خەڵاتێکی جیهـانی بۆ سـاڵی ....
٤- بەتەواوی فێری زمانی ئینگلیزی ببم بۆ ساڵی ....
٥- بەژداری بکەم لە کۆنفرانس و دیداری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بۆ ساڵی ....
٦- بـەژداری بکـەم لـە دروسـتکردنی تـۆڕی راهێنـەرانی کوردسـتان و، رۆڵـم هەبێت لە دانـانی پێـوەرەکانی راهێنـەری بـواری پەرەپێـدانی مرۆیـی بـۆ سـاڵی ....

پاشـان کاتی دیاریکـراو بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم ئامانجانـە دیـاری دەکرێت، سـاڵێك یان زیاتـر، وەك لـەکاتی ئامانجـە جێبەجێکارییەکانـدا ئاماژەمـان بـۆ کـرد، بیـرت نەچێـت ئـەو رۆڵـەی لەژیـانی کرداریتـدا ئەنجامـی دەدەیـت هەتـا زیاتـر لەگـەڵ ئامانجەکەتـدا گونجاوبێـت، مانـای وایـە تـۆ لەسـەر ڕێگـە راسـتەکەیت، بەپێچەوانەشـەوە هەتاوەکـو دوورتربێـت لـەو ئامانجانـەی دەتەوێـت بیانهێنیتـەدی ئـەوە زیاتـر لەبەدیهێنانیـان دوور دەکەویتـەوە.

کەواتـە ئامانجەکان ئـەو پلیکانانەن دەتگەیەنن بە دیدگاکەت و خزمەتی مەبەسـتەکەت دەکـەن و، هەریـەك لەم دوانەش (دیـدگاو ئامانج) دەبنە بناغـەی ئامانجەکەی دواتر.

**دابەشـــکردنی دیـــدگاو ئامانجەکان بـــۆ ئامانجـــی ســـتراتیجی و، ئامانجی مەودا مامناوەنـــدو، کورت مـــەوداو ئـــەرکی جێبەجێکاریی**

دابەشکردنی دیدگاو ئامانجەکان بۆ ئامانجی ستراتیجی و، ئامانجی مەودا مامناوەندو، کورت مەوداو ئەرکی جێبەجێکاریی





## ستراتیجی هێنانەدی دیدگا بەشێوازی خەیاڵکردنی زیندوو

دەتوانیت بەخێرایی زۆر و باشترین شێوازی ئەنجامدان بگەیت بە هەر مەبەستێك، ئەگەر هات و توانیت بەشێوازی ئەندێشەکردنی زیندوو وێنەیەکی زەینی بکێشیت، هەموو ئەوەی لەسەرتۆیە ئەوەیە زیادەڕەوی نەکەیت لە دیاریکردنی پێوەرەکان و خۆت بەدوور بگریت لە پێشبینی نابەجێ و، هەموو تەرکیزت بخەیتە سەر ئەو مەبەست و ئامانجە واقعیانەی خۆت دەزانیت توانای ئەوەت هەیە بیانهێنیتەدی:

١- بیهێنە بەرچاوت، تۆ ئەو راهێنەرە جیاوازە سەرنجڕاکێشەیت (ئەگەر دەتەوێت ببیتە راهێنەر)، یاخود بیهێنە بەرچاوی خۆت تۆ مێردێکی بەختەوەریت، یاخود بزنسمانێکی سەرکەوتوویت و، لەلوتکەدایت.

٢- پاشان ئەو مەبەستە بنووسە کە وای لێکردویت هەوڵ بدەیت بۆ بەدیهێنانی دیدگاکەت، بەو مەرجەی مەبەستەکە یەکێك بێت لە بوارەکانی ژیان، هەروەها ئەوەش بنووسە کە هەریەك لەو بوارانە چۆن بەتوندی و ئارەزوویەکی زۆرەوە پاڵت پێوە دەنێن بۆ گەیشتن بە دیدگاکەت.

٣- ئێستا لە گۆشەیەکی ئارامی دوور لە دەنگەدەنگدا دانیشە، پاشان چاوەکانت داخەو چۆنت پێخۆشە بحەوێرەوە، هەتا ئەوکاتەی هەست بە ئارامی و پشوودانی تەواو دەکەیت، هەناسەیەکی هێواش و قووڵ هەڵمژەو، چەندجارێك ئەمە دووبارە بکەرەوە، بۆئەوەی هەست بە پشوودانی زیاتر بکەیت، بیهێنە بەرچاوت لە باخچەیەکی جوانی پڕ لەگوڵ و گوڵزاردایت، ئەو باخچەیە سەرچاوەی حەوانەوەو ئارامی تۆیە، کاتێك بەناو ئەم باخچەیەدا دەڕۆیت دەرگایەکی گەورەی رەنگ سەوز دەبینیت لێی نوسراوە: داهاتووە پرشنگدارەکەت. بەهێواشی لەدەرگاکە نزیك دەبیتەوە و ئارەزووتە بچیتە ناو داهاتووە پرشنگدارەکەتەوە، لەبەردەم دەرگاکەدا دەوەستیت بۆ بینینی جوانی سرووشتی ئەم باخچەیەو، هەتابێت زیاتر هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەروونی دەکەیت، لەبەردەم ئەو دەرگایەدا قادرمەیەك دەبینیت لە پلیکانەی یەکەمی نوسراوە لایەنی رۆحانی، لەوێدا دەوەستیت و بیردەکەیتەوە، ئەو بیرۆکە رۆحانیانە چین کە پێویستت پێیانە بۆئەوەی بگەیتە دیدگاکەت؟ پاشان پلیکانەیەکی دیکە دێیتە خوارەوە بۆ لایەنی کەسی، بۆئەوەی بزانیت ئەو لێهاتوویی‌و کارامەییە پێویستانە چین بۆ گەیشتن بە دیدگاکەت؟ ئینجا پلیکانەیەکی دیکە دێیتە خوارەوەو دەگەیت بە لایەنی زانستی و بیردەکەیتەوە، بۆئەوەی بزانیت ئەو لایەنە زانستیانە چین کە پێویستت پێیانە بۆ گەیشتن بە دیدگاکەت؟ پاشان دادەبەزیت بۆ پلیکانەی چوارەم و لەوێدا بیردەکەیتە لەو شتانەی لە لایەنی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە گشتیەکاندا پێویستت پێیانە بۆ گەیشتن بە دیدگاکەت؟ دوای ئەوە دەچیتە سەر لایەنی پیشەیی و بیردەکەیتەوە لەو لایەنەوە چیت پێویستە بۆ گەشتن بەدیدگاکەت؟ ئینجا دادەبەزیت بۆ پلیکانەی شەشەم بۆئەوەی بزانیت لەلایەنی تەندروستیەوە چیت پێویستە بۆ بەدیهێنانی دیدگاکەت؟ دوای ئەوە دێیتە خوارەوە بۆ پلیکانەی حەوتەم و بیردەکەیتەوە بزانیت لەڕووی داراییەوە پێویستت بە چەند پارە هەیە بۆ هێنانەدی دیدگاکەت؟ پاشان دادەبەزیت بۆ پلیکانەیەکی دیکە تاوەکو بزانیت ئەو پەیوەندییە خێزانییە سەرکەوتووانە کامانەن کە یارمەتیت دەدەن لە بەدیهێنانی دیدگاکەتدا، بەمجۆرە بەردەوام دەبیت لە بڕینی پلیکانەی لایەنەکانی دیکەی ژیانت، دواترو کاتێك دەگەیتە کۆتایی قادرمەکە، هەناسەیەکی هێواشی قووڵ هەڵمژە، ئێستا دەرگایەکی سەوزی کاڵی درەوشاوە لەبەردەمتدایەو، لەخۆیەوە دەکرێتەوە، بۆئەوەی خۆت لە داهاتووە پرشنگدارەکەتدا

ببینیت، کە هەرچیت دەوێت هاتۆتەدی، هەناسەیەك هەڵمژەو لە وێنەکە بچۆرە پێشەوەو زەردەخەنەیەکی بۆ بکەو رێزێکی زۆری لێ بگرە، ئەم وێنەیە لە مێشکتدا هەڵگرەو پاشان بیربکەرەوە لەوەی ئەم وێنەیە چیت بۆ دەهێنێتەدی و، تەواو لەوە دڵنیابە کە راستەقینەیە، پاشان هەناسەیەکی زۆر قوڵ بۆ ئەو وێنەیەی داهاتووە پرشنگدارەکەت هەڵمژە کە لە مێشکتدا هەڵت گرتووە و، بەرەو دەرگا سەوزەکەو پلیکانەی یەکەم بگەڕێرەوە، لەگەڵ برینی هەر پلیکانەیەك بەرەو سەرەوە بیهێنە بەرچاوت کە ئێستا خاوەنی هەموو ئەو توانایانەیت لە بوارەکانی ژیانی کەسی و پیشەیی و دارایی و کۆمەڵایەتی و زانستی و لایەنەکانی دیکە...، بەردەوامبە هەتاوەکو دەگەیتە دەرگا گەورەکە، کە بریتیە لە ئێستا.

٤- پاشان لە (ئێستا)دا بوەستە و هەوڵ بدە خۆت ببینیت خەریکی پلاندانانیت بۆئەو واقعەی بینیت.

٥- جگە لە ئەندێشەی خۆت، هیچ شتێك ناتوانێت توانای تۆ لە دووبارەهێنانەوەی ئەو وێنە زەینیە هاندەرەی لە گەشتەکەتدا دەستت کەوتووە سنوردار بکات، دەتوانیت لەرێگای مامەڵەکردن لەگەڵ مەبەست و ئامانجەکانت (بە هەموو هەستەکانت) ئەندێشەت بەهێز بکەیت، تامی چێژەکەی بکە، بۆنەکەی هەڵمژە، تەماشای بکە، گوێی لێبگرە، دەستی لێبدە (ئەگەر توانیت)، هەرشتێك لە بەدیهێنانی ئەو ئەنجامانەی دەتەوێت بیانهێنیتەدی نزیکت دەکاتەوە بایەخی پێبدەو بەکاری بهێنە.

٦- با لەمڕۆوە دیدگاکەت روون بێت، رۆژانە تەماشای بکە و، تەرکیز بخەرە سەر ئامانجەکەت هەتا ئەوکاتەی دەیهێنیتەدی، تەماشای دواتەوە مەکە و گوێ بۆ بۆچوونی کینە لەدڵان مەگرە، بەقسەی شکستخواردووەکان کاریگەر مەبە، پابەندبە بە دیدگا و مەبەستەکەتەوە، لەو رێوشوێنانەی بەکاریان دەهێنیت مرونەتت هە بێت.



# قۆناغی سێیەم

# پلاندانان

- تایبەتمەندی و بنەماکانی پلانی باش.
- هونەری بەڕێوەبردنی کات.
- قۆناغەکانی دانانی پلان.
- خشتە پێشنیارکراوەکان بۆ پلانی گشتی.

**پێناسەی پلاندانان:** بریتیە لەو بڕیارانەی بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو دەدرێن، لەڕێگای چەند هۆکارێك و، لەکاتێکی دیاریکراودا.

بریتیە لەو قۆناغە فیکری و زەینیانەی تایبەتن بەهەر کارێکەوە، دەستپێدەکات بە بیرکردنەوە لە ئامانجەکان و چۆنێتی بەدیهێنانیانیان و، هاوسەنگیکردن لەنێوان ئەو بارودۆخە ئایندەییانەی لەوانەیە هاوکاربێت لە بەدیهێنان یان کۆسپ خستنەڕێی، لەئەنجامی ئەمەوە دەبینە خاوەنی پلانەکە.

پلاندانـان تەنهـا بـە دانـانی پلانەکـەو بڕیارلێـدانی کۆتایی نایـەت، بەڵکو پرۆسـەیەکی بەردەوامـە و، خـۆی دەبینێتـەوە لـە پێداچوونـەوەو دووبـارە داڕشـتنەوەو گۆڕانـکاری تێداکـردنی، بەشـێوەیەکی ڕێکخـراو نـەك بـە هەڕەمـەکی و بێسـەروبەرەیی.

پـلان واتـە: وردکردنـەوەی ئەو ئیشـوکارانەی پێویسـتە ئەنجـام بدرێـن و، دیاریکردنی ئـەرك و تایبەتمەندییەکان و، دیاریکردنی کات بۆ هەرقۆناغێك لە قۆناغەکان، بەمەبەسـتی گەیشـتن بە ئامانجـە دیاریکراوەکە.

**پلاندانان خاڵی جیاکردنەوەی نێوان مرۆڤی سەرکەوتوو کەسانی ترە، نەك هێزو زانیاری.**

ئێسـتا هەسـتە بـە دیاریکـردنی ئـەو هەنـگاوە سـەرەکیانەی پێویسـتە بیانگریتەبـەر بـۆ گەیشـتن بـە مەبەسـتە دیاریکراوەکانـت، چۆنێتـی ڕیزکردنیشـیان دیـاری بکـە، بۆئەوەی پەیڕەوکردنیـان ئاسـان بێـت، خـۆت بـەدوور بگـرە لـە تێکـەڵ وپێکەڵـی و دژیـەکی و دووبـارە، کاتێـك بڕیاری ئەنجامـدانی دەدەیت کورتتریـن ڕێگا بگرەبەر، چاوپۆشـی بکە لـە هەمـوو ئـەو ئەرکـە ناگرنـگ و ناپێویسـتانەی دێنەڕێـت، دڵنیابـە لـەوەی پلانـت هەیە بـۆ کاتی نـاکاوو، لەدەمـی ڕوودانی هـەر ڕووداوێکـدا ئامادەیـە بـۆ جێگرتنـەوەی پلانـە سـەرەکیەکە.

باسـی هەمـوو ئـەو پێوەرانـە بکـە لـە دیاریکـردنی ئـەو ئامانجانـەی دەیانهێنیتـەدی بەکاریـان دێنیـت، هەروەهـا پێوانەکردنی کوالێتـی ئەوکارانەی بـۆ هێنانـەدی ئامانجەکان پێـی هەسـتاویت، پێوەرێـك بۆ کاروبـارە جیـاوازەکانی وەك کێشی دابەزێـنراو و، زانیاری بەدەسـتهاتوو، پلەبەرزکردنـەوە یـان زیادکـردنی مووچە دابنێ، پێشـوەختە پێشـبینیەکانت دیـاری بکـە، بەڵام ئەگـەر بارودۆخـت گـۆڕا، ئامادەبـە بـۆ پێداچوونەوەی.

**جیاوازی نێوان مرۆڤی سەرکەوتوو شکستخواردوو ئەوەیە: مرۆڤی سەرکەوتوو کاتێك دەست بە ئیشەکە دەکات دڵنیایە لە سەرکەوتن، بەڵام مرۆڤی شکستخواردوو بەپێچەوانەوە.**

## تایبەتمەندی و بنەماکانی پلانی باش:

١- پێویستە کات بۆ تەواوکردنی دیاریکرابێت.

٢- واقعی بێت، خەیاڵ پڵاوی نەبێت، واتە پلانەکە واقعی و ئاسان بێت و لەچوارچێوەی توانا مادی و مرۆییەکاندابێت.

٣- گشتگیربێت، واتە پلانەکە بەشێوەیەکی هاوسەنگ هەموو لایەنە زیندوو گرنگەکان بگرێتەوە.

٤- مرونەتی تێدابێت، ئەوەش بۆ رووبەڕوو بوونەوەی گۆڕانگارییە جیاوازەکان و، هەر رووداوێکی ناکاوو مامەڵەکردن لەگەڵی بە چارەسەری گونجاو و، دۆزینەوەی جێگرەوەو بژاردەو ئەنجامدانی گۆڕانکاری گونجاو.

٥- بەژداریکردن لە یەکخستنی هەوڵەکان (خێزان، دامەزراوە، کارگێڕی، ...) و بەژداری پێکردنیان لە پرۆسەی پلاندانان.

٦- هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ پلاندانان و ئەو بەشانەی بەشێوەی ئاسۆیی لە پلانەکە جێبەجێ دەکرێن (واتە فراوانکاری لەبوارێکی دیاریکراوی پلانەکە)، یاخود ستوونی (واتە کشان بەرەو ئاستەکانی سەروتری پلانەکە).

٧- پاڵپشتبێت بە ئامانج یان چەند ئامانجێکی روون و رێکخراو، لەسەربنەمای کارە گرنگ و لەپێشترەکان.

٨- پشتبەستوو بێت بە شیکاری کردنێکی دروست بۆ ئەوکارانەی بەگوێرەی کارە گرنگ و لەپێشترەکان پێویستە جێبەجێ بکرێن.

٩- پشت ببەستێت بەو توانایانەی هەتە، پاشان بیرکردنەوەو گەڕان بەدوای پێویستی نوێدا.

١٠- سرووشتێکی کرداری هەبێت، دووربێت لە بێسەروبەرەیی، واتە یاساو رێسای روونی بۆ جێبەجێکردن هەبێت.

**ناتوانیت بگەیتە قوڵایی زەریاکان، ئەگەر جورئەتی دووركەوتنەوە لە كەنارەكانت نەبێت.**

١١-پلانەکە جێگرەوەو بژاردەی گونجاو لەخۆ بگرێت:

أ- دیاریکردنی گرنگترین مەترسی و دەرفەتە پێشبینی کراوەکان.

ب- دیاریکردنی رادەی ئەگەری رووداوان یان بەدەستهێنانی.

ت- دیاریکردنی ئاماژە کردارییەکان، کە بەڵگەن بۆ دەستکردن بەکار.
پ- دیاریکردنی رادەی مەترسی یان قازانجکردن.
ج- دانانی هێڵە گشتیەکانی پلانی جێگرەوە.
ح- دیاریکردنی ئەو هەنگاوانەی دەگیرێنەبەر، لەکاتی روودانی هەرکام لەو ئاماژانە.

## بەرلەوەی دەست بە دانانی پلانەکەت بکەیت، بنەماکانی سەرکەوتنت بیربێت:

١- ئەوەی حەزت لێیەو دڵت دەیگرێت ئەوە بکە، ئەگەر نەتتوانی ئەوە ئەوکارەی دەیکەیت خۆشت بوێت.
٢- گرنگ نییە ئەوکارە بکەیت کە ئارەزووت لێیەتی، بەڵام گرنگە ئەوکارەی دەیکەیت ئارەزووت لێی بێت. پەندێکی ئینگلیزی
٣- دەرفەتەکان بقۆزەرەوەو، با دەستکەوتەکان بەهایەکی بەرزتر لە چێژوخۆشیان هەبێت.
٤- تەرکیز بخەرە سەر تواناکان و، دەستکەوتی بەردەوام و، فێربوونی پەندو وانە لە شکستەکانەوە، پێویستە دەستکەوتەکان لە شکستەکان زیاتربن.
٥- دەستکەوتەکانت هەڵسەنگێنە و، پاشان بەبەردەوامی چاکسازی تێدا بکە.

**نهێنی سەرکەوتن ئەوەیە بۆ ئامانجەکانت دڵسۆزبیت.**

## لەکاتی دانانی پلانەکەتدا مرونەتت هەبێت

هەموو شتەکانی دەوروبەرت دەگۆڕێن، تەنانەت ئەو پلانەشی کە بەتۆکمەیی دانراوە، لەکاتی دەستکردنت بە جێبەجێکردنیدا شانبەشانی رووداوەکان ناڕوات، لەڕاستیدا، زۆربەی پلاندانەرە لێهاتووەکان کۆکن لەسەرئەوەی تاکە پلانێك بتوانێت ١٠٠٪ لەگەڵ رووداوەکاندا بڕوات ئەو پلانەیە کە هەر ئێستا دانراوە، بۆیە لەکاتی پلاندانانـدا نەرمبەو رەچاوی ئەم شتانە بکە:

١- **جێگرەوەو ئەگەرو بژاردەکان:** پرۆسەی گەڕان بەدوای جێگرەوەو تواناو بژاردەکان هەوڵێکن بۆ دۆزینەوەی هەموو جێگرەوە یان بژاردە یان تواناکان، لەکاتی سەیرکردنی بارودۆخێکی دیاریکراودا، ئەگەر بیرۆکەکە باش و گونجاو هاتە پێشچاو ئەوە ئاسایی نیە بەردەوامبین لە گەڕان بەدوای جێگرەوەی باشتر لەوە،

لەگـەڵ ئەمەشـدا دەکرێت چەنـد ئەگەرێك هەبـن. کاتێك دەتەوێـت بڕیارێك بدەیت یاخـود لـە دۆخێـکی دیاریکـراودا هەڵوێسـتێك بنوێنیـت، لەوانەیـە هەمـوو بـژاردە و جێگـرەوەکان بـۆ ئەو بڕیـار یان هەڵسـوکەوتە بەردەسـت نەبـن، ئەمەش لەسـەرەتای پرۆسـەی بیرکردنـەوەدا روودەدات، بەڵام بـە بەردەوامبوونت لـە بیرکردنەوەو گەڕانت بـەدوای ئـەو بژاردانەدا، بـۆت دەردەکەوێت بـژاردەو جێگرەوەی زۆر لـەوە زیاتر هەن کـە تـۆ گومانت بـردووە.

٢- **بۆچـوونی کەسـانی دیکـە:** هەندێـك هەڵوێسـت و بـارودۆخ هـەن پێویسـت دەکات کەسـانی تریـش لەگەڵمانـدا بیربکەنـەوە.

تێڕوانینی ئەوکەسـانە بەشـێکی سـەرەکییە لە فراوانکردنی دۆخی بیرکردنەوەکە، چونکە لەوانەیـە ئەوکەسـانە ئامانجـی جیـاوازو ئەولەویـەتی جیـاوازو جێگـرەوەی جیاوازیـان هەبێـت، بەوپێیـەی مـرۆڤ دەتوانێـت تەماشـای بۆچـوونی کەسـێکی تر بـکات و لێشی تێبـگات، کەواتـە ئەمـە دەبێتـە بەشـێکی گرنگ لـە پرۆسـەی بیرکردنـەوەو پلاندانان.

**ئەوەی راوێژی بەخەڵك کرد، هاوبەشی بە هۆشمەندییەکەیان کردووە**

٣- **هونـەری بەڕێوەبـردنی کات:** هـۆکارە بۆ بەڕێوەبـردنی رۆژەکەت و، پێشـڕەوی کردنی ژیانـت بەرەو سـەرکەوتن.

کات زۆر بەسـادەیی بریتیـە لە: تەمەنی مـرۆڤ و هەموو ژیانی. تەمەنیـش دیاریکراوە، بەهیـچ جۆرێـك ناتوانرێـت زیـاد بکرێـت و سـەرچاوەیەکی زۆر دەگمەنـە، ناتوانرێـت کـۆگا بکرێت، ئەو سـاتەی بەباشـی بـەکاری ناهێنیـت دەفەوتێـت، قەرەبـوو ناکرێتەوە.

**وتراوە: سپێدەی هیچ رۆژێك هەڵنایەت، ئیللا یەکێك بانگ دەکات: ئەی نەوەی ئادەم من رۆژێکی نوێم و بەسەر کارەکانتەوە شایەتم، بۆیە بەباشی بەکارم بهێنە، چونکە کە رۆشتم هەتا رۆژی قیامەت نایەمەوە بۆلات.**

## مەبەستمان لە بەڕێوەبردنی کات چییە؟

بریتیـە لـەو رێـگاو هۆکارانـەی پێویسـتە لەسـەر مـرۆڤ بـۆ بەدیهێنـانی ئامانجـەکانی بەتـەواوی سـوودیان لێوەرگرێت و، لەژیانیدا هاوسـەنگی رابگرێت لەنێـوان ئەرکەکانیو حـەزو ئامانجەکانیدا.

ســـودوەرگرتن لـــەکات خاڵـــی جیاکـــەرەوەی نێوان کەســـانی ســـەرکەوتوو شکســـتخواردووە، چونکە نیشـــانەی هاوبەشـــی هەموو کەسە ســـەرکەوتووەکان ئەوەیە کە دەتوانن هاوســـەنگی رابگرن لەنێـــوان ئەو ئامانجانـــەی دەیانەوێت بەدیان بهێنن و، ئـــەو ئەرکانەی پێویســـتە ئەنجامی بدەن، ئەم هاوســـەنگییەش بەهۆی باش بەڕێوەبردنی خودەوە دروســـتدەبێت، ئەمەش بەر لەهەموو شـــتێك پێویســـتی بەوەیە ئامانـــج و پەیامێك هەبێت لەســـەری بڕۆیـــن، چونکە ئەگەر مـــرۆڤ ئامانجێکی بۆ ژیانی خـــۆی دیاری نەکردبێت، ئیتر پێویســـتی بـــەوە نییە کاتی خـــۆی رێکبخات، لەبەرئـــەوەی ژیانی پەرتەوازەیەو هیچ ئاڕاســـتەیەکی دیاریکراوو دەســـتکەوتێکی نییە، خۆ ئەگـــەر دەستکەوتێکیشـــی هەبوو، ئەوە کەمەو شـــیاوی باســـکردن نییە.

کەواتـە بەرلـەوەی دەسـت بکەیـت بـە جێبەجێکـردنی ئـەم پلانـە، پێویسـتە کۆمەڵـە ئامانجێـك بـۆ ژیانـت دابنێیـت، دەتەوێـت لـەم ژیانەتـدا چـی بهێنیتـەدی؟ چیـن ئـەو شـتانەی دەتەوێـت ئەنجامیـان بدەیـت بۆئـەوەی دوای مردنـت ببنـە دەسـتکەوتی دیارو ئاشـکرای ژیـانی تـۆ؟ ئـەو پسـپۆڕییە کامەیـە دەتەوێـت شـارەزاییت تیایـدا هەبێـت؟ کارێـکی نەگونجـاوە لـەم سـەردەمی تایبەتمەندیـەدا زەینـی خـۆت بەزیـاد لـە شـتێکەوە سـەرقاڵ بکەیـت، بۆیـە پێویسـتە بـە جـدی بیـر لـەم مەسـەلەیە بکەیتـەوە و، وەڵامـی بۆ بدۆزیتـەوەو، پـلان بـۆ ژیانـت دابنێیـت، دوای ئەمـە ئینجا مەسـەلەی رێکخسـتنی کات دێتەپێشـەوە.

## ئەنجامەکانی باش بەڕێوەبردنی کات:

١- کەسـی راڕا پێویسـتی بـە دووهێنـدەی ئـەو کاتـە هەیـە کـە کەسـێکی ئاسـایی بـۆ ئەنجامدانی کارێك پێویسـتیەتی، رێکخسـتنی کات یارمەتیـت دەدات لە ئەنجامدانی کارەکان بـەوردی و ئارامـی دەروونی.

(خـۆت خاوبکـەرەوەو مرونەتت هەبێـت، هەسـتە بەئەنجامدانی ئـەو گۆڕانکارییانەی پێـت خۆشـە، چونکـە خـۆت دانـەری پلانەکەیـت و، هـەر خۆشـت مـافی ئەنجامدانی گۆڕانـکاری و بەڕێوەبـردنی کاتەکانـت هەیە).

٢- هەمـوو پرۆژەیەك ئەوکاتەی پێویسـتە کە بـۆی دیاریکراوە، جا ئەگـەر دوو کاتژمێرمان بـۆ کۆمەڵـە کەسـێك تەرخانکرد تا کارێکی تێـدا ئەنجام بدەن و، بۆ کۆمەڵێك کەسـی تریـش چـوار کاتژمێرمـان تەرخانکـرد تاوەکـو کارێـکی تێـدا ئەنجـام بـدەن، دەبینین هـەردوو کۆمەڵەکـە کارەکەیـان لەو کاتـەدا تەواو دەکـەن کە بۆیـان دیاریکراوە.

**هەر خولەکێك لە پلانداناندا بەسەر دەبەیت، لەکاتی جێبەجێکردندا کاتێکی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە.**

٣- بەڕێوەبـردنی کات مانـای ئەوە نیـیە کارەکانـت زۆر بەخێرایی ئەنجـام بدەیت، بەڵکو مانـای ئەوەیە بەشـێوەیەکی دروسـت و راسـت و کاریگەرانـە ئەنجامیـان بدەیت، کە خزمـەتی ئامانـج و خەونە کەسـیەکانت بکەن.

ئـەوە بزانـە سـەرکەوتن بە بڕی ئـەو کارانـە ناپێورێت ئەنجامیـان دەدەیـت، بەڵکو بەوە دەپێورێـت ئـەو کارانـە تـا چ رادەیـەك کاریگـەری ئەرێنـی کردۆتـە سـەر ژیـانی خۆت و کەسـانی دەوروبەرت.

٤- کەمکردنـەوەی فشـارەکان، جـا فشـاری کار بێـت یـان ژیـان. (تەرکیـز بکـەو زەینت بەزیـاد لـە شـتێکەوە سـەرقاڵ مەکە).

٥- بەدیهێنـانی ئەنجامـی باشـتر لـەکار و ژیانـدا. (وەك چـۆن لەسـەرکەوتنەکانمەوە فێردەبـم، ئاوهـاش لـە هەڵەکانمـەوە فێردەبـم).

## هەنگاوەکانی رێکخستنی کات

دەتوانیـت گۆڕانـکاری لـەم هەنگاوانـەدا بکەیـت، یاخـود هـەر جێبەجێیـان نەکەیت، لەبەرئـەوەی هەمـوو کەسـێك رێگایەکی جیـاوازی تایبـەت بەخۆیی هەیە لە ڕێکخسـتنی کاتـدا، گرنـگ ئەوەیـە بنەما گشـتیەکانی رێکخسـتنی کات پەیـڕەو بکەیت.

١- **تەماشـای رۆڵـەکانی ژیانـت بکـە:** تـۆ لەوانەیـە بـاوك یـان دایـك بیـت، لەوانەیـە برا بیـت، لەوانەیـە کـوڕ بیـت، نەخێـر لەوانەیـە کارمەنـد یـان کرێـکار یـان بەڕێوەبـەر بیـت، هەریـەك لەم رۆڵانـە پێویسـتیان بەوەیـە کۆمەڵێك کاریـان بۆ ئەنجـام بدرێت، بۆنمونە: خێزان پێویسـتی بە چاودێری و ئەنجامدانی دانیشـتنی خێـزانی هەیە، ئەگەر بەڕێوەبـەری دامەزراوەیەکیـت، ئـەوە دامەزراوەکەت پێویسـتی بەوەیـە پێشی بخەیت و، پـلانی بـۆ دابنێیـت و، بڕیـاری گونجـاوی بـۆ بدەیـت و، کاری بەرهەمـداری بـۆ بکەیت .

٢- **بـۆ هـەر رۆڵێـك چەنـد ئامانجێـك دیـاری بکـە:** مەرجیش نیـە ئامانجێـکی دیاریکراو بـۆ هەمـوو رۆڵـەکان دابنێیـت، چونکـە هەندێـك رۆڵ هـەن لەوانەیە هەتـا ماوەیەکی تـر ئەنجامیـان نەدەیـت، وەك رۆڵـی بەڕێوەبـەر، ئەگەرهاتـوو لەمۆڵەتدابویت.

٣- **رێـکی بخە:** لێرەدا مەبەسـتمان لە رێکخسـتن ئەوەیە خشـتەیەکی هەفتانـە دابنێیت و،

ئـەو ئامانجانـەش دیاری بکەیت کە پێویسـتە لـەو هەفتەیەدا ئەنجامیـان بدەیت، وەك ئامانجـەکانی پەرەپێـدانی خود لەڕێگای بەشـداریکردن لە خول یـان خوێندنەوە، یان ئامانجـی خێزانی، وەك ڕۆیشـتن بۆ گەشـت یـان ئەنجامدانی دانیشـتنێکی خێزانی بۆ قسـەکردن و گفتوگۆکـردن، یاخود ئامانجـی کار، وەك دانانی پلانی بازاڕسـازی، یان ئامانجـی پەیوەندیەکانت لەگـەڵ هاوڕێیان.

٤- **جێبەجێی بکـە:** لێرەدا هـەوڵ بدە پابەندبیت بـەو ئامانجانەی بۆ هەفتەکـەت داتناون، لـەکاتی جێبەجێکردنیشـدا مرونەتـت هەبێـت، لەوانەیـە لەمـاوەی ئـەو هەفتەیـەدا هەندێـك دەرفەتـت بـۆ بێتە پێش، کـە لەکاتی دانـانی پلانەکەتـدا بەبیرتـدا نەهاتبێت، بۆیـە ئـەو دەرفەتانە بقۆزەرەوەو مەترسـە لـەوەی نەتوانیت بەتـەواوی ئامانجەکانی ناو خشـتە هەفتانەییەکەت جێبەجـێ بکەیت، لە کۆتایی هەفتەکەدا خۆت هەڵسـەنگێنەو، بزانـە لەکوێـدا کەمتەرخەمیـت کردووە چـاکی بکەرەوە.

**تێبینی:** ڕێکخسـتنی کاری ڕۆژانە کە بەهۆیەوە هەڵدەسـتیت بـە پەیرەوکردنی پرۆگرامی هەفتانـە، باشـترە لـەوەی بەرنامـەی هەفتەکـەت دانێیـت و ئینجا هـەوڵ بدەیـت لەماوەی حـەوت ڕۆژەکـەی هەفتـەدا جێبەجێیـان بکەیـت، لەبەرئـەوەی حاڵـەتی یەکـەم ڕێگـەت دەدات ڕووبـەڕووی حاڵـەتی نـاکاو ببیتـەوەو مامەڵـەی لەگەڵـدا بکەیـت، بەبـێ ئـەوەی ببێتـە هـۆی لەدەسـتچوونی کاتی جێبەجێکـردنی ئامانـج و کارەکانت.

## قۆناغەکانی دانانی پلان بەشێوەی کرداری

بۆئەوەی بتوانیت لەماوەی کاتێکی دیاریکراودا پلان بۆ ئاییندەت دابنێیت، پێویستە:

١- لە بارودۆخی ئێستا بکۆڵیتەوەو شیکاری بکەیت (دەستنیشان کردن).

٢- (ئەگـەر هەبـوو) هەسـتیت بـە لێکۆڵینـەوەی پلانـەکانی پێشـوو، سـوود وەرگرتـن لە زانیـاری یان خشـتەکانی پێشـوو.

٣- دابینکردنی ئەو زانیاری و ئامارانەی بۆ دانانی پلانەکەت پێویستن.

٤- دیاریکـردنی دیـدگاو پەیـام و ئامانجـە گشـتی و درێـژەکان و، تێگەشـتن لـەوکارەی دەتەوێـت.

٥- دیاریکـردنی ئـەو سـتراتیجیاتانەی بەهۆیانـەوە ئامانجـە سـاڵانەکان دێنینـەدی، ئـەوەش بەدیاریکـردنی سـەرچاوەو هـۆکارە پێویسـتەکان بۆ گەیشـتن بـە ئامانجەکان (دیاریکـردنی کات، سـەرچاوە، کەرەسـتەی خـاو، چـالاکی، پرۆسـەکان، هـاوکاری ئـەو کەسـانەی دەکرێـت یارمەتیـمان بـدەن، ...).

٦- دیاریکـردنی کۆمەڵێـك جێگرەوە و بـژاردەی ئەوتۆ کـە بمانگەیەنـن بەئامانجەکانمان و هەڵبـژاردنی باشـترینیان، ئـەوەش لەڕێـگای ئاشـنابوون بـە خاڵـی بـاش و خراپـی هەریـەك لـەو جێگرەوانـەو توانـای جێبەجێکردنیان.

٧- دیاریکردنی ڕەشنوســـــی پلانێکی ســــەرەتایی، کە شـــیاوی جێبەجێکردن بێت و، تەماشــــاکردنی ئەنجامە نزیــــك و دوورەکانی و، لایەنە ئەرێنـــــی و نەرێنیەکانی.

٨- داڕشـتنی پلانێـکی تـازەی گونجـاوی ئەوتـۆ کە هەتـا دەکرێـت خاڵی بێت لـە خاڵی نەرێنـی و کۆسـپ و ڕێگر.

٩- لەســــەر جێبەجێکردنی پــــلانی مانگانە یان ســــاڵانە بەردەوامبە، بــــۆ بەدیهێنانی ئامانجــــەکان و، بەبەردەوامی هەڵســــەنگاندن و ڕێککردنەوەی.

١٠-ئەگـەر دوای تەواوبـووونی مـاوەی پلانەکـەت پلانێکی نوێـت دانایەوە، ئەوە پشـت بەخـوای گەورە ببەسـتە و، دەسـت بکە بـە جێبەجێکـردنی پلانەکـە و، بەردەوامبە لە هەڵسـەنگاندن و ڕێککردنـەوەو چاککردنی.

بـەر لـەوەی دەسـت بەجێبەجێکـردنی پلانەکـەت بکەیـت، توێشـووی خـۆت ئامـادە بکـەو، دڵنیابـە لـەوەی جانتـای پلانەکـەت هەمـوو کەرەسـتە پێویسـتەکانی گەشـتەکەی تێدایـە، هەروەهـا ئـەم خاڵانەشـت لەپێشـچاوبێت:

أ- تەرکیـزت لەسـەر ئەوەبێت کە بەردەسـتەو دەتوانیت بیکەیت، چاوەڕێی باشـبوونی بـارودۆخ مەکە.

ب- ویستت بەهێز بکە بەرامبەر ئاستەنگە زۆرەکان.

ت- بۆ باشکردنی بارودۆخ و ژینگەی کارەکەت پلان دابنێ.

پ- بۆ زیادکردنی بەرهەمداریت، شارەزاییەکانت لە تەکنەلۆجیا بەکاربێنە.

ج- بۆ ئەنجامدانی کارە گرنگەکانت، ئەوپەڕی وزەی خۆت بەکار بێنە.

**ڕاهێنـان: لەلاپەڕەیەکـدا ڕەشنوسـی پـلانی ئامانجێـکی سـتراتیجی خۆت بنووسـە، ئەم شـتانەی تێدابێت:**

تێڕوانینـی گشـتی داهاتـووت: تـۆ لەکوێدایـت؟ دەتەوێـت بگەیتـە کـوێ؟ لەمەشـدا ڕەچـاوی هەمـوو ڕۆڵـەکان و، کاتی دەسـتپێکردن و تەواوبـوونی ئامانـج و پرۆژەکانـت بکـە، هەروەهـا هەنـگاوی یەکەمـی کارەکـەت و، ئـەو جێگـرەوەو بژاردانـەی کـە لەگەڵ توانـاو دەرفەتـەکانی بەردەسـتدا دەگونجێـن:

**سەرکەوتوو ئەوەکەسەیە نرخی سەرکەوتن دەزانێت و، ئامادەیی تێدایە باجی ئەو سەرکەوتنە بدات.**

دانـانی پلانەکـە لـە خشـتەدا: مەبەسـت ئەوەیە هەسـتیت بـە ئامادەکردنی خشـتەیەکی وردودرشـتی ئـەو چالاکیانـەی بـۆ بەدیهێنـانی ئامانجـەکان پێویسـتە ئەنجـام بدرێـن، هەروەهـا دابەشـکردنی ئـەو کارانەی دەویسـترێت ئەنجام بدرێن، بەجۆرێـکی وا بتوانیت بەئاسـانی بگەڕێیتـەوە بۆیـان و، زانینـی ئـەو کەسـەی جێبەجێیـان دەکات و، مێـژووی جێبەجێکـردن و ئەنجامـدانی.

# نمونەی خشتەیەکی پێشنیارکراو بۆ پلانێکی گشتی

| دیدگا | بیمە ڕاهێنەرو ڕاوێژکارێکی جیهانی جیاواز بۆ پەرەپێدان و بەختەوەرکردنی خۆم و کەسانی دیکە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامانجە دورودرێژەکان | ستراتیجیەتی بەدیهێنانی ئامانجەکە | جێبەجێکار یان هاوکار | مێژوی دەستپێکردن | مێژووی ئەنجامدان | دیاریکردنی جێگرەوەو بژاردەکان | تێبینیەکان |
| ١- ئامانجی زانستی: ئەنجامدانی توێژینەوەیەك بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی جیهانی | نامەناردن بۆ زانکۆ، یان کۆنفرانسەکان | من و تیمی کارەکەم | ٢٠٢١/٧/١٥ | ٢٠٢٢/١١/١٧ | توێژینەوە یان نوسینی پەرتووکی بواری پەرەپێدان | زانکۆی دیکە، دیداری زانستی |
| ٢- ئامانجی کەسی: فێربوونی قسەکردن بەزمانی ئینگلیزی | تەرخانکردنی کات بۆ خوێندنی ئینگلیزی | من و مامۆستا تایبەتەکەم | ٢٠٢١/٨/١٥ | ٢٠٢٣/٩/١٥ | یوتیوب | گەشتکردن بۆ بەریتانیا |
| ٣- ئامانجی پیشەیی: ئەنجامدانی توێژینەوە لەبواری پەرەپێدانی سەرچاوە مرۆییەکان | سەنتەرە باوەرپێکراوەکان، بەژداریکردن لەگەڵ هاوڕێیان | من و ئەکادیمیای عەرەبی | ٢٠٢١/٦/١٥ | ٢٠٢٤/١١/١٥ | سەنتەرە کوردیەکان | بەژداریکردن لە خولی گونجاوو تایبەت بەو بوارە |
| ٤- ئامانجی رۆحانی: لەبەرکردنی جوزئی ٥ و ٦ی قورئانی پیرۆز | لەمزگەوت لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێکانم | من و هاوڕێکەم | ٢٠٢٠/٨/١ | ٢٠٢١/٩/٣٠ | فەرمودەی پیرۆز و فیقە | جوان خوێندنەوەی قورئان |
| ٥- ئامانجی پیشەیی: پێشکەشکردنی ٦٠ خولی راهێنان و ٢٤ سیمینار | سەنتەرە کوردیەکان | من و راهێنەران | ٢٠٢٠/٧/١ | ٢٠٢١/٧/١ | کۆڕ | سیمینار |

بـە گەڕانـەوە بـۆ ئامانجـەکانی پێشـووت، ئـەو خشـتەیەی خـوارەوە پـڕ بکـەرەوە و، ناوێـکی ئەرێنـی هاندەریشـی بـۆ دابنـێ

## لـەم خشـتەیەدا پلانەکـەت بنووسـەو، ناوێکـی ئەرێنـی هاندەریشـی بـۆ دابنـێ

| دیدگا | ببمە راهێنەرو راوێژکارێکی جیهانی جیاواز بۆ پەرەپێدان و بەختەوەرکردنی خۆم و کەسانی دیکە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامانجە دورودرێژەکان | ستراتیجیەتی بەدیهێنانی ئامانجەکە | ئامانجە دورودرێژەکان | ستراتیجیەتی بەدیهێنانی ئامانجەکە | ئامانجە دورودرێژەکان | ستراتیجیەتی بەدیهێنانی ئامانجەکە | ئامانجە دورودرێژەکان |
| | | | | | | |

چەنـد نمونەیـەك بـۆ نـاوی پلان: پلانی ئەسـپی سـەرکێش، یان ئاسـکی قەشـەنگ، یان هـەوای خاوێن، یـان ....

## خشتەی ئەرکی مانگانە یان هەفتانە

پێویسـتە ئامانـج و، ئـەو ئەرکانەی بـۆ بەدیهێنـانی ئامانجەکانت جێبەجێیـان دەکەیت، لە ماوەیـەکی دیاریکـراودا بێت.

| خشتەی دابەشکردنی هەنگاوەکانی مانگێك بۆ هەر ئامانجێك | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامانجی ستراتیجی | مانگی یەکەم | مانگی دوەم | مانگی سێیەم | مانگی چوارەم | مانگی پێنجەم | مانگی ... | .... |
| یەکەم ........... | | | | | | | |
| دوەم ........... | | | | | | | |
| سێیەم ........... | | | | | | | |
| چوارەم .......... | | | | | | | |
| پێنجەم ........... | | | | | | | |

## خشتەی کاروبارە هەفتانەو رۆژانەییەکان

ئـەم خشـتەیە یارمەتیـت دەدات لـەوەدا بـەوردی مامەڵـە لەگـەڵ کاتـدا بکەیـت و، بەرچاورِوونـت دەکات بـە کاتژمێـرەکانی چـالاکی زەینـی و ئەوکاتانـەی بەفیرِۆیـان دەدەیـتو، یارمەتیـت دەدات لـەوەی لەکۆتایـی هەمـوو رۆژو هەفتەیەکـدا لەخـۆت بپرسـیتەوە بـۆ نەهێشـتنی کاتی بەفیـرِۆ دراو، بۆئەوەی بەباشـترین شـێوە کاتەکانت بەکار بهێنیـت:

| خشتەی هەفتانە بۆ ئامانجە رۆژانەییەکان لە - / / ٢٠٢٠ | | | | هەڵسەنگاندن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| کاتژمێر - | ١٢ - ٥ | ٦ - ١ | ١٢ - ٧ | |
| شەممە | | | | |
| یەکشەممە | | | | |
| دووشەممە | | | | |
| سێ شەممە | | | | |
| چوار شەممە | | | | |
| پێنج شەممە | | | | |
| هەینی | | | | |

تێبینـی: دەکرێـت لەبـری ئـەم خشـتەیە یاداشـتێکی رۆژانـە بەکاربێنیت، بـەڵام دەبێت هەفتانـە یـان مانگانـە لەخـۆت بپرسـیتەوە (ئـەم خشـتەیە بـە گەرِانـەوە بـۆ زانیارییەکانی نـاو خشـتەکانی پێشـوو پرِدەکرێتـەوە) و، پێویسـتە خشـتەی رۆژانـە بـۆ مـاوەی زیاتـر لە مانگێـگ بەکاربهێنرێـت، بۆئـەوەی بەباشـی و بەردەوامی شـارەزای ئـەم لێهاتووییەبیت.

## رێگاکانی هەڵسەنگاندنی پلان

### کە لەکاتی پلاندانان و قۆناغەکانی تردا پشتی پێدەبەستین

**١- تەماشـاکردنی ئەنجامـە لۆجیکیـەکان و لێکەوتـەکانی:** هەر پلان یـان داهێنانێکی نوێ یـان یاسـا یـان برِیارێـك ئامانجێکـی هەیـە، کـە لەوانەیە لـە ماوەیـەکی دیاریکـراودا ئەنجـام بدرێـن، هـەر کارێکیـش کـە بیـر لەئەنجامـدانی دەکەیتەوە، پێویسـتە پێشـتر ئەنجامەکانیـت لەبەرچاوبێـت.

بۆیـە پێویسـتە بـەوردی لـە ئەنجامـە لۆجیکیـەکان و لێکەوتـەکانی ئەوکارانـەی دەمانەوێـت ئەنجامیـان بدەیـن بکۆڵینـەوە، بۆئـەوەی دوای ئـەوەی برِیارمانـدا، بزانیـن چـۆن بەشـێوەیەکی دروسـت مامەڵـە لەگـەڵ ئەو شـتانەدا بکەین کـە لەوانەیـە روو بدەن.

لەمەشـدا سـێ جـۆر ئەنجامـمان هەیـە:

أ- ئەنجامی خێرا

ب- ئەنجامی مەودا مامناوەند

ت- ئەنجامی دوورمەودا

لەوانەیـە یەکێـك لەوکارانـەی ئەنجامـی دەدەیـن ئەنجامـە خێـراکانی باشـبن، بـەڵام ئەنجامـە مـەودا مامناوەنـد یـان دوورمـەوداکانی خـراپ بـن، یاخـود بەپێچەوانـەوە.

**٢- تەماشـاکردنی هەنگاوەکان و چارەسـەرکردنی بیرۆکەکان (ئەرێ، نەرێ):** ئامانجی ئەم ڕێگایـە چارەسـەرکردنی بیرۆکەکانـە لەڕێگای تەماشـاکردنی بیرۆکەکان بەشـێوەیەکی بابەتیانـە و بێلایەنانـە، لەبـری ئـەوەی بڵێیـن حەزمـان لـە بیرۆکەیـەکی دیاریکـراو هەیـە، یاخـود حەزمـان لێـی نییـە، دەتوانیـت ئـەم شـێوازە بـەکار بێنیـت و بەهۆیەوە خاڵـە باشـەکانی بیرۆکـە یـان بابەتێکی دیاریکـراو بزانیت (ئـەرێ)، پاشـان دەتوانیت خاڵـە خراپـەکانی بزانیت (نـەرێ)، هەروەهـا دەتوانیت ئـەم شـێوازە وەك ڕێگایەك بۆ هەڵسـەنگاندنی پلان و پێشـنیارەکان بەکار بێنیت، زۆر ئاسانیشـە داوا لەهەرکەسـێك بکەیـت هەسـتێت بـە چارەسـەرکردنی بیرۆکـەکانی نـاو بۆچونێـکی دیاریکـراو، ڕەنگـە داوات لێبکرێـت خـۆت ئـەم ڕێگایە بـەکار بێنیت، پاشـان بزانیت ئایـا بیرۆکە ئەرێنیـەکان زیاتـرن یـان بیرۆکـە نەرێنیـەکان، پاشـان هەسـتیت بـە گۆڕانکاریکـردن یـان خۆرزگارکـردن لـە خاڵـە نەرێنیـەکان، ئینجـا هەسـتیت بـە پارێزگاریکـردن یـان پەرەپێـدانی بیرۆکـە ئەرێنیـەکان، ئەمـەش بـۆ دەسـتەبەرکردنی سـەرکەوتنی پلانەکە.

پێـوەری پرۆسـەی پلاندانـان بۆ داهاتووت: هـەوڵ بدە بەوپەڕی ڕاسـتگۆییەوە وەڵامی ئەم پرسـیارانەی خوارەوە بدەیتـەوە و، وەڵامەکانیش لەخانەی وەڵامەکاندا بنووسـە:

| ژ | نەخێر (١). دەگمەن (٢). جارجار (٣). زۆربەی جار (٤). هەمیشە (٥) | وەڵام |
|---|---|---|
| ١ | هەست دەکەیت پێویستە پلانێکت هەبێت کاریکاتە سەر ژیان و سەرکەوتنەکانت؟ | |
| ٢ | ئایا بەهۆی هەبوونی پلانەوە بوویت بە خاوەنی ڕێگاو شێوازی خۆت بۆ ڕزگاربوون لە کۆسپەکان؟ | |
| ٣ | ئایا پێشتر هیچ هەوڵێکت داوە بۆ دانانی پلانی نوسراو؟ | |
| ٤ | ئایا دیدگاو پەیامەکەت ڕوونە بەلاتەوە؟ | |
| ٥ | ئایا هیچ بینش(تصور)ێکی ڕوونت هەیە سەبارەت بەداهاتوو؟ | |
| ٦ | ئایا پلانەکەت ئامانجی دوورمەودای دیاریکراوو ڕوونی تێدایە؟ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٧ | ئایا پلانەکەت هیچ شیکارییەکی تێدایە بۆ ژینگەی ناوخۆیی و دەرەکی؟ | | |
| ٨ | ئایا لێکۆڵینەی تێدایە بۆ بەها باوەکانی ژینگەکەت؟ | | |
| ٩ | ئایا پلانی جێگرەوەی پەدەگی تیایە؟ | | |
| ١٠ | ئایا بینشێکی تێدایە بۆ بوجەی گشتی پێشبینیکراوی پێویست؟ | | |
| ١١ | ئایا هەنگاوە رێکاریی(إجرائي)ەکانی تێدایە بۆ بەردەوامبوون و پێشکەوتن؟ | | |
| ١٢ | ئایا هەڵسەنگاندنی کەسی بەردەوام هەیە بۆ ئاستی پلانەکە؟ | | |
| ١٣ | ئایا لەلایەن لایەنی دیکەوە هەڵسەنگێنراوە؟ (لایەنی راوێژکاری یان تایبەت) | | |
| ١٤ | ئایا بەگوێرەی بارودۆخی ژینگەی ناوخۆیی و دەرەکی گۆڕانکاری لە پلانەکەتدا دەکەیت؟ | | |
| ١٥ | ئایا پێتوایە ئەو زانیارییانەی پلانەکەت لەسەر داناوە بەردەست و وەك پێویستن؟ | | |
| ١٦ | ئایا بەپێی پێویستی و تواناکانت هەوڵی جێبەجێکردنیان دەدەیت؟ | | |
| ١٧ | ئایا پێت وایە ئەو پلانەی داتناوە و لەسەری دەڕۆیت لەگەڵ خولیاکانتدا دەگونجێت؟ | | |
| ١٨ | ئایا بەهۆی جێبەجێکردنی پلانەکەتەوە هەستت بەهیچ گۆڕانکارییەك کردووە لەژیانتدا؟ | | |
| ١٩ | ئایا پلانەکەت هاندەرو پاڵنەری تێدایە بۆ جێبەجێکردن و بەدواداچوون؟ | | |
| ٢٠ | ئایا بەردەوام دەبیت لەسەر پلانی نوسراو؟ | | |
| کۆی گشتی | | | |

## ئەنجام: لەسەر بنەمای ئەو نمرانەی بەدەستت هێناون، ئاستی ئامادەباشیی خۆت بزانە:

١- ٩٠ - ١٠٠: ژیانت باشتر دەبێت، پیرۆزە، هەتاوەکو ژمارەی وەڵامەکانت راستترین ئامادەباشی زیاترت تێدایە بۆ پلاندانان و جێبەجێکردنی.

٢- ٧٠ - ٨٩: هەوڵ دەدەیت هانی خۆت بدەیت، دەکرێت بڕۆیت بەرەو باشترین ساڵەکانی ژیانت.

٣- ٥١ - ٦٩: دڵنیانیت لەوەی بەڕاستی ئامادەیت بۆ پلاندانان، پێویستە لەگەڵمان بەردەوامبیت.

٤- ٥٠ و کەمتر: وادیارە هێشتا ئامادە نیت، پێویستە تەماشای ئاراستەکانت بکەیت، بۆ ئەوەی زیاتر متمانەت بەخۆت هەبێت، لەگەڵمان بەردەوامبەو بەڕاستی هەوڵ بدە ژیانت رێك بخەیت.



# قۆناغی چوارەم
# ڕێکخستن و جێبەجێ کردن

- کاروبارە لەپێشترو گرنگەکان و ڕێکخستنی ئەرێنی.
- پلانی بەگەڕخستن.

## کاروبارە لەپێشترو گرنگەکان (الأولويات المهمة)

لەوانەیە ئەو ئامانجانەی دەتەوێت بیانهێنیتەدی جۆراوجۆربن، بەڵام دژی یەك ناوەستنەوە ئەگەربێت و بەگوێرەی لەپێشتربوون و گرنگیان ریزیان بکەیت، جا ئەگەر دوو کارت هەبوو، بزانە یەکەمجار دەبێت دەست بەکامیان بکەیت.

ئەولەویاتەکانت ریزبکە: مامۆستایەکی بەشی کارگێڕی لەبارەی گرنگی ڕێکخستنی کاتەوە بابەتێکی پێشکەش کرد، بۆئەوەی لەبیرۆکەکە تێ بگەن نمونەیەکی راستەقینەی بۆ باسکردن.

نمونەکە بریتیبوو لە هەڵسەنگاندنێکی کورت، هات سەتڵێکی بچووکی لەسەر مێزەکە داناو، کۆمەڵێك بەردی تاڕادەیەك گەورەی هێناو، یەك لەدوای یەك بەوردی

خستنیه نـاو سـەتڵەکەوە، دوای ئـەوەی سـەتڵەکە پڕبـوو لە قوتابیـەکانی پرسـی: ئایا ئەو سـەتڵە پڕبووەتەوە؟

قوتابیەکان وتیان: بەڵێ.

مامۆسـتاکە پێـی وتـن: دڵنیـان؟ پاشـان لەژێـر مێزەکەیدا کیسـێکی پـڕ لـە وردە بەردی دەرهێنـاو کردیـە نـاو سـەتڵەکەوە، هەتا بۆشـایی نێوان بـەردەکانی پڕکـردەوە.

پاشـان جارێـکی تر پرسـی: ئایا ئـەو سـەتڵە پڕبووەتەوە؟ یەکێـك لە قوتابیـەکان وتی: لەوانەیـە پـڕ نەبووبێتەوە...

مامۆسـتاکە وەڵامی قوتابیەکەی بەلاوە باشـبوو، ئینجا هەسـتا بەدەرهێنانی کیسـێك لم و هەڵی رشـتە ناو سـەتڵەکەوە و هەموو بۆشـاییەکانی نێوان بـەردەکانی پڕکردەوە.

**ئەمجارەش پرسیاری کردەوە: ئایا ئێستا سەتڵەکە پڕبۆتەوە؟**

وەڵامـی هەمـوو قوتابیـەکان: نەخێـر، بـوو، دوای ئـەوە مامۆسـتاکە پەرداخێـکی پـڕ لەئـاوی هێنـاو هەڵـی رشـتە نـاو سـەتڵەکەوە هەتـا پڕبـوو.

**ئەمجارە لێی پرسین: ئایا ئێستا سەتڵەکە پڕبووە؟**

هەندێك لە قوتابیەکان وتیان: بەڵێ.

دوای ئـەوە مامۆسـتاکە کوپێـك قـاوەی هێنـاو کردیـە نـاو سـەتڵەکەوە، هەتاوەکـو بەتـەواوی پڕبـوو.

**لێی پرسین: بە بڕوای ئێوە بیرۆکەی پشت ئەم ئەزموونە چیبوو؟**

هەندێـك لـە قوتابیـەکان بەجـۆش وخرۆشـەوە وتیـان: خشـتەی کاروبـاری مـرۆڤ هەرچەنـد پڕبێـت لـە ئیشـوکار، هێشـتا هـەر دەتوانێـت کاری زیاتـرو زیاتـر بـکات.

مامۆسـتا وەڵامـی دایەوە: راسـتتان کـرد... بەڵام ئەوە هۆکارە سـەرەکیەکە نییە، پاشـان خـۆی وەڵامـی دایـەوەو وتی: ئـەم نمونەیـە فێرمـان دەکات، ئەگـەر یەکەمجـار بـەردە گەورەکانمـان دانەنایـە، هەرگیـز نەمـان دەتـوانی لەنـاو سـەتڵەکەدا دایـان بنێین.

پاشـان وتی: لەوانەیـە هەندێکتـان بپرسـن: ئـەو بـەردە گەورانـە ئامـاژەن بـۆ چـی؟ ئـەوە ئامانـج و پـڕۆژەکانی ژیانـتن کـە دەتەوێـت بیانهێنیتـەدی، وەك: خوێنـدن و خولیاو بەختەوەرکـردنی ئەوانەی خۆشـت دەوێن و، هەرشـتێکی دیکە کە لەژیانتـدا بایەخی هەیە.

هەمیشـە بیرتـان بێـت یەکەمجـار بـەردە گـەورەکان بخەنـە نـاو سـەتڵی ژیانتانـەوە، ئەگەرنـا دواتـر هەرگیـز ناتوانـن بیخەنـە نـاوی.

پاشــان یەکێـك لە قوتابیەکان بەجۆش و خرۆشـێکەوە پرســی: ئەی نهێنــی ئەوە چیبوو بـە کوپێك قاوە ســەتڵەکەت پڕکرد؟

مامۆسـتاکە وەڵامـی دایـەوە: مرۆڤ ئەگـەر هەوڵ و کۆششـەکانی خۆیی خسـتەگەڕ، ئـەوە دەتوانێـت کاری زۆرو زەوەنـدە ئەنجـام بـدات و، کاتێکیـش بدۆزێتـەوە بـۆ خواردنـەوەی کوپێـك قـاوە لەگـەڵ ئەوکەسـەی خۆشـی دەوێـت.

تۆش ئەی براوخوشکی خۆشەویستم... ئەمشەو یان سبەی بەیانی زوو لەخۆت بپرسە: بەردە گەورەکانی ژیانت کامانەن؟ ئینجا یەکەمجار لەناو سەتڵی ژیانتدا دایان بنێ.

دەتوانیـت بگەڕێـت بـەدوای ئـەو بیرۆکانـەی لەهەمـوو شـتێکی دیکـە گرنگـترو لەپێشـترن و، دوای دۆزینەوەیـان ئەولەویـەت بدەیت بەوانەو، یەکەمجار دەسـت بکەیت بـە جێبەجێکردنی ئەوانـە. دەتوانیت ئەمانە بکەیتـە پێوەری بڕیاردان لەسـەر بیرۆکەکانت.

- تەرکیز نەخسـتنە سـەر ئـەو کارانـەی گرنگترو لەپێشـترن دوورت دەخەنەوە لە ئاڕاسـتە راسـتەقینەکەی ژیانـت، لەبەرئـەوەی سـەرقاڵبوونت بـەو چالاکیـە ناگرنگانـەوە رەنگە دەسـتبگرن بەسـەر ژیانتدا.

## (بیرۆکەکان بەبێ کردار هیچ بەهایەکیان نیە)

- ئەوەی پێت وایە گرنگترن، لەوانەیە لەریزی کارە گرنگەکانی کەسێکی تردا نەبن.
- پێویسـتە بزانیت بۆچی شـتێکت خسـتۆتە ریـزی کارە گرنگ و لەپێشـینەکانی خۆتەوە، چونکـە دانـانی ئـەو شـتە لەریـزی کاری گرنـگ و لەپێشـینەی خـۆت وەك بڕیـاردان لەسـەر بیرۆکـەی ئـەو کارە وایە.

لـە ئاهەنگـی کردنـەوەی شـاری یـاری (دیـزنی لانـد)ی بەناوبانـگ کـە لـە ویلایەتـە یەکگرتـووەکانی ئەمریکایـە، پرسـیار لـە (واڵـت دیزنـی) دیزاینـەرو خـاوەنی ئەم شـاری یارییـە کـرا: ئایـا پێشـبینی دەکـرد شـاری یارییەکـەی بـەم شـێوازە دەرچێـت؟

لەوەڵامـدا وتی: لەڕاسـتیدا ئـەم شـاری یارییـە یەکێـك بوو لـە ئامانجە سـەرەکیەکانم، هـەر لەوکاتـەی لـە زیندانبووم رێك بەو شـێوەیەی کـە ئێسـتا دەیبینن لەزەینمدا نەخشـەم بـۆ کێشـابوو، هیـچ گومانێکـم نەبوو لـەوەی رۆژێـك لـە رۆژان رووناکی دەبینێـت (ئەم واڵـت دیزنیـە بەهۆی کێشـەی داراییـەوە زینـدانی کرابوو).

## بــەڵام ئایــا هــەر بەڕاســتی ئێســتا تــۆ ئامادەیــت بۆ گۆڕانکاریــی؟

کاتێـك بـە نیەتێـکی سـافەوە بڕیاردەدەیـت گۆڕانـکاری لـە ژیانتـدا بکەیـت، هەمـوو ڕێـگاو هـۆکارو هەستەکانت بخـەرە کارو، پشـت بەخـوای گەورە ببەسـتە، ڕێگـە مەدە هیـچ شـتێك (هەرچەنـد بەهێـز بێت) یـان هەرکەسـێك (هەرچەنـد کاریگەری لەسـەرت هەبێـت) ڕێگاو کاروانی گۆڕانکاری و گەشـەکردنت پەك بخـات و لەمپەر بێنێتە ڕێگات.

## ڕێکخستنی کات بەشێوەیەکی ئەرێنی

ڕێکخســـتنی ئەرێنی لەســـەر دوو پایەی ســـەرەکی دەوەســـتێت، کـــە بریتین لە: پلاندانانو، ڕێکخســـتنی کارە گرنگ و لەپێشـــترەکانت.

**(أدوین بلس) بەم شێوەیەی خوارەوە کارە گرنگ ولەپێشترەکانی ڕێکدەخات:**

**ئەولەویـەتی (أ):** تایبەتە بـە کاروبارە گرنگ و پەلەکان، کە بریتیـن لەو کارانەی لەڕێگای بەڕێوەبـردنی قەیرانەکانـەوە ئەنجامیـان دەدەیـن، یاخود بەشـێوەی ئەو ئاگـر کوژێنەوانەی کـە تەنهـا لـەکاتی ئاگرکەوتنـەوەدا دەکەونـە جوڵـە. زۆربەی خەڵـك تەرکیز دەخەنە سـەر ئـەم شـێوازە، لەبەرئەوەی پێویسـتی بـە پلاندانان نیـە، یاخود لەبەرئـەوەی ناچارن.

**ئەولەویـەتی (ب):** تایبەتـە بەکاروبـارە گرنـگ و ناپەلـەکان، کە بریتین لـەو کاروبارانەی ئەنجامیـان دەدەیـن و، ئەو دیدگایەی لەڕێگای پلانی سـتراتیجی و بەڕێوەبـردنی ئاییندەوە دای دەڕێژین، زۆربەی خەڵك ئەم ئەولەویەتە پشـتگوێ دەخەن، لەبەرئەوەی ئەنجامەکانی دوورمەودایـە، هەروەهـا باوەڕیـان وایـە مـادام کاروبارەکان بەشـێوەیەکی گونجـاو دەڕۆن بەڕێـوە پێویسـت بەدانـانی پـلان نـاکات، لەبەرئـەوەی پێشـتر ئەمجـۆرە ئەولەویەتەیـان لە جێبەجێکـردنی کارەکانیانـدا تاقـی نەکردۆتەوە و، هەتا ئێسـتا سـوودەکانیان نەزانیوە.

**ئەولەویـەتی (ج):** پەیوەنـدی هەیـە بـە کارە خێراو نـا گرنگەکانەوە، بریتیە لـەو کارانەی بـۆ ڕازیکـردنی کەسـانی دیکـە ئەنجامیـان دەدەین، یاخـود لەبەرئـەوەی نـرخ و بەهاکەی نازانیـن، یـان لەبەرئـەوەی ڕانەهێنراویـن لەسـەر بەڕێوەبـردنی خـود و، وەبەرهێنـانی کاتەکانمـان وەك سـەرچاوەیەکی سـتراتیجی و بوارێـك بـۆ ڕکابـەری.

**کەواتە ئەمڕ ئاستی زانیارییەی ئێستا، ئارەزوو خەون و خولیاکانی گەنجان تێرناکات، بۆیە پێویستە بەردەوام هەوڵی ئاشکراکردن و دۆزینەوەی زیاتر بدەن، ئەوە دوای ئەوە لە بەدیهێنانی ئەستەمەکاندا سەرکەوتوو دەبن.**

## خود بەڕێوەبردنی چالاکانە پێوستی بەوەیە کە:

زۆربـەی کاتەکانت بـۆ ئەنجامدانی کاروبارەکانی ئەولەویـەتی (ب) تەرخان بکەیت و، بەشـێکی زۆریشـی بۆ بەڕێوەبـردنی ئەولەویەتی (أ) و، کەمترین کاتیشـت بـۆ مامەڵەکردن لەگـەڵ ئەولەویەتی (ج)دا بێت.

هەروەهـا ئەولەویـەتی (د)یشـمان هەیـە، کـە تایبەتـە بـە کارە ناگرنـگ و ناپەلەکانەوە، ئەمجـۆرە چالاکیـە ناچێتـە چوارچێـوەی کارە سـەرەکیەکانەوە، لەبەرئـەوەی کات و هەوڵـەکان لـەو کاروچالاکیانەدا بەفیڕۆ دراون کە هیچ سـوودێکیان نیـە، وەك: پەیوەندی تەلەفـۆنی تایبـەت و، کۆبونەوەی لابـەلا، دەکرێت بەسـەر ئەمەدا زاڵبیـن لەڕێگای پلانی پێشـوەختەو، تەرخانکـردنی بەشـێك لـەو کاتەی لێـرەدا بەفیـڕۆی دەدەین بـۆ ئەولەویەتی (ب)، ئەویـش بەدانـانی ڕێوشـوێنی ئەوتـۆ کـە ڕزگارمان بـکات لە چالاکیـەکانی (د).



## کاری رۆژانەو هەفتانە

دوای ئـەوەی زانیـت چـۆن ئەولەویاتەکانـت دیـاری بکەیـت، ئێستا دەتوانیـت هاوشـان لەگـەڵ ئـەم بیرۆکانـەی خـوارەوەدا بەکاریـان بهێنیـت، کـە یارمەتیـت دەدات لەکۆنترۆڵکـردنی کاروبـاری رۆژانـەو هەفتانـەت:

١- لەمـڕۆوە پـلان بۆ کاری سـبەینێت دابنێ، لەسـەر شـێوەی لیسـت یان هەنـگاوی کار بیانووسـە، ئەم لیسـتە زوو بنووسـە، چونکە یارمەتیت دەدات لەوەی بەزەینێکی سـاف و دیدگایـەکی روونـەوە رۆژەکەت دەسـت پێبکەیت.

٢- مرونەتـت هەبێـت و هەسـتی ناوەکـی و سروشـت و شـارەزاییەکانت بەکاربێنـە، بـۆ ئـەوەی بەگوێـرەی پێویسـتیەکانی کارەکـەت گۆڕانکاری لـە ئەولەویـات و کاتەکاندا بکە یت .

٣- رۆژانـە کاتێکی تایبەت دیاری بکـە، بۆئەنجامدانی ئەو کارە زۆرگرنگانەی پێویسـتیان بـە تەرکیزێـکی زۆر هەیـە، لـەم کاتـەدا دەتوانیـت پشـوویەك بدەیـت (تەنانـەت ئەگـەر کاتی ئیشـکردنیش بـوو)، یاخـود بەتەنهـا لەشـوێنێکدا دانیشـیت، ئـەم جـۆرە کاتانـە تەرخـان بکـە بـۆ پلاندانـان، یـان هەڵسـەنگاندن، یـان پێداچوونـەوە، یاخـود خوێندنـەوەی راپـۆرت و نوسـینی سـەرنجەکانت لەسـەری.

٤- لـە لیسـتەکانی کاری رۆژانە یـان هەفتانەتـدا ئەولەویاتـەکانی (أ) و (ب)ت لێ تێکەڵ نەبێـت و، ئاگاداربـە شـێوازی ئاگرکوژێنـەوە زاڵنەبێـت بەسـەر کارو ژیانتـدا، مەهێڵە رۆژانـە ئەولەویـەتی (أ) لـە سـێ بۆ چوار چـالاکی زیاتر بێـت، هەرچەند لەسـەرەتادا بەلاتـەوە قورسـبێت بـەڵام هـەوڵ بـدە رۆژانـە هەندێـك کات بـۆ ئەولەویـەتی (ب) تەرخـان بکەیـت، کاتێـك ئەولەویـەتی (ب) پێشـدەکەوێت بەخێرایـی بەرهەمەکـەی دەچنیتـەوە و دەسـتدەکەیت بـە بەدیهێنانی هەندێك لـە ئامانجـە دوورمەوداکانت، کە وردە وردە دەبێتـە هـۆی کەمکردنـەوەی رادەی پشبەسـتنت بـە ئەولەویاتـەکانی دیکە، بیریشـت نەچێت کـە کاتـت ژیانتە.

٥- رۆڵـەکانی ژیانـت بیربێـت، ئەوانـەی کە لـە هەنـگاوی یەکەمـدا دەستنیشـانت کردن (قۆناغـی دەستنیشـانکردن)، دەتوانـم چیبکـەم بۆئـەوەی ئاسـتم باشـتربێت و بتوانم هەمـوو کاروبارەکانـم بەشـێوەیەکی باشـتر ئەنجـام بدەم؟

٦- هـەرکات دەرفەتـت بـۆ رەخسـا هەوڵ بـدە بگەڕێیتـەوە بۆ لیسـت یان خشـتەکانت، لەبەرئـەوەی لـە رێکخسـتنی کات و جێبەجێکـردنی پلانەکەتـدا یارمەتیـت دەدات.



# پلانی بەگەڕخستن

## چیرۆکی شێر

شـێرێك هەبوو لە دارسـتانێكدا دەژیا، چەند ڕۆژێك بوو هیچـی نەخواردبوو، لەكەناری ڕووبارێكـدا وەسـتابوو، دەیویسـت بپەڕێتـەوە ئەوبـەری ڕووبارەكـە، بەڵكو لەوێ شـتێكی دەسـتكەوێت بیخـوات و لەبرسـان نەمرێـت، ئەم شـێرە مەلەكردنی نـەدەزانی، بۆیـە هەروا وەسـتابوو تەماشـای ڕووبارەكـەی دەكـرد، وای دەزانی ئـەو نایەڵێت بپەڕێتـەوە بۆئەوبەری ڕووبارەكـە، بۆیـە بڕیاریـدا بەهەمـوو هێـزی خـۆی هێرش بكاتە سـەری، بـەڵام كەوتە ناو ئاوەكـەوەو زۆری نەمابـوو نقوم بێت و بمرێت، بۆیە بەپەلە هاتەدەرەوە، دیسـانەوە هێرشـی كـردەوە سـەر ڕووبارەكـەو، ئەمجارەش خەریكبوو بخنكێـت و بەهەزارحـاڵ ڕزگاری بوو، چەندجارێـكی تر هێرشـی كـردەوە، بـەڵام دەرەنجامـی هەمـووی هەرئەوەبوو كـە دەكەوتە نـاو ڕوبارەكەو، بەهـەزار لنگەفرتـێ ئینجا دەیتوانی بێتـەوە دەرێ.

سـەرەنجام ماندوو بوو، دانیشـت و تەماشـای ئاوەكەی دەكردو لە تووڕەییـدا دەینەڕاند، بـەڵام بێسـوودبوو، بۆیـە بەخەمبـاریێ و بێدەنگـی لێی ڕاكشـا، ئالێرەدا گوێی لـە دەنگێك بـوو لەناو ئاوەكەوە دەهاتـە دەرێ و پێی دەوت: (لەگەڵ دوژمنێكـدا مەجەنگێ كە بوونی نییە)، شـێرەكە تەماشـای سـەرچاوەی دەنگەكەی كردوو پرسـی: ئەوە كێیە قسـەدەكات؟

دەنگەکـە وەڵامـی دایـەوە: منـم، ئەو ڕووبـارەی هەوڵدەدەیـت هێرش بکەیتەسـەری، من ڕووبـارم وەك چـۆن تـۆ شـێریت، هێرشـکردنە سـەرمن ئـەوەت ناداتـێ کـە دەتەوێـت، لەبەرئـەوەی لەگـەڵ دوژمنێکـدا دەجەنگێیت کە بـوونی نیە.

شـێرەکە دانیشـت و بەهێمنی دەسـتی کرد بەبیرکردنەوە، بینی وا پارچە تەختەیەك بەدەم شـەپۆلەکانەوە بـەرەولای ئەم دێـت، خۆی هەڵدایە سـەری و هاوسـەنگی خۆیی ڕاگرت و پەڕییـەوە ئەوبەری ڕووبارەکە، ئینجا وەسـتاو بەسەرسـوڕمانەوە تەماشـای ڕووبارەکەی دەکـرد، گوێـی لەدەنگـی ڕووبارەکەبـوو پێـی دەوت: ئـەی شـێر ئێسـتا چـی دەڵێیـت؟ ئایـا هیـچ دوژمنێـکی ڕاسـتەقینەت هەبـوو؟ یاخـود تەنهـا تراویلکەیـەك بوو، لـە زەین و تێگەیشـتنی خۆتـدا بـۆت دروسـت بووبـوو؟ شـێرەکە پێکـەنی و سوپاسـی ڕووبارەکەی کـردو، داوای لێبـوردنی لێکرد لەسـەر ئـەو ڕەفتـارەی نوانـدی بەرامبەری، ئینجا ڕۆشـت بەڕێـگای خۆیـەوە بـۆ گەڕان بـەدوای خواردنـدا، بەڵام ئەمجـارە بووە خـاوەنی پەندێکی گـەورەی وەك: (لەگـەڵ دووژمنێکـدا مەجەنگـێ کە بـوونی نییە).

بۆیـە هیـچ خاووخلیچکی مەکە لە جێبەجێکـردنی ئەوەی پلانت بۆ دانـاوە و دەتەوێت بیهێنیتەدی.

## شیکارکردن و ڕێکخستنی هەنگاوە ڕێکارییەکان و، بەمرونەتەوە مامەڵەکردن لەگەڵ جێگرەوەو بژاردە ستراتیژیە کەسیەکان

دوای هەمـوو ئـەم شـیکاریانەی کردمان دەگەینـە قۆناغێکی گرنگ لە پلانی کەسـیدا، کـە پەیوەنـدی هەیـە بـەو سـتراتیژیەتە گونجاوانـەی بۆ ئـەم دۆخەی ئێسـتامان باشـترین بژاردەمـان دەخاتـە بەردەسـت، تاوەکـو بەهۆیـەوە بتوانین بۆشـایی نێـوان هەڵبژاردنەکان کەمکەینەوە و، پشـت ببەسـتین بە بەرهەمی بەیەکگەشـتنی خاڵی بەهێـزو دەرفەتی بەهێز، پاشـان ئـەم بژاردانـەش کـورت بکەینەوە بـۆ یەك سـتراتیجیەت، بۆئـەوەی ببینـە خاوەنی هاوسـەنگیەکی بـاش و، بەباشـترین شـێوە جێبەجێـی بکەیـن، ئەمـەش بەشـێوەیەکی سـەرەکی پشـت بە مرونـەت و چاودێریکردنی بـەردەوام دەبەسـتێت.

سـتراتیجیەتیش لەوشـوێنەدا هەیـە کە هەڵوێسـتێکی ئاڵـۆز هەیە و، وا پێویسـت بکات بیـر لـە هـۆکارەکان و لێکدانەوەیـان و پێشـبینیکردن بۆ کاردانـەوەکان بکەینـەوە، ئەمەش لەگـەڵ بارودۆخێکی گـۆڕاوو نەزانراودا مامەڵـە دەکات، بەمەبەسـتی بەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکان:

هەنگاوی یەکەم: چۆن لەسەر بنەمای شیکارکردنی فاکتەرەکان پلانی ستراتیجی دادەنێیت؟




هەنگاوی دووەم: دانانی کاروبارەکان لەناو ستراتیجیەتەکەدا (إيقاع العمل في الإستراتيجية)

| | |
|---|---|
| دانانی وریایانەو خێرا | ئەگەر تیمەکە بەهێزبوون |
| | ئەگەر بارودۆخ سەقامگیربوو |
| | ئەگەر کێبڕکێ بەهێزبوو |
| | ئەگەر کاتی بەردەست کەم بوو |
| دانانی وریایانەو هێواش | ئەگەر تیمەکە فشۆڵ و لاوازبوو |
| | ئەگەر بارودۆخەکە ناجێگیربوو |
| | ئەگەر دۆخی کێبڕکێ روون نەبوو |
| | ئەگەر کاتی بەردەست زۆربوو |

ئەو شێوازی دانانە هەڵبژێرە، کە لەگەڵ پلانەکەتدا دەگونجێت

پێویسته بەمرونەتەوە کارەکە بخەینە ناو ستراتیجیەتەکەوە، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە لەگەڵ توانا و دەرفەتەکاندا بگونجێت، هەروەها چاودێریکردنی بەردەوامی کاری ناو ستراتیجیەتەکە و، بردنە پێشەوەی پلانەکە بەوجۆرەی لەگەڵ دۆخی ئێستادا بگونجێت.

**هەنگاوی سێیەم: هەڵبژاردنی قەبارەی وەبەرهێنان**

| | |
|---|---|
| قەبارەی وەبەرهێنان (مادی - مەعنەوی) زیاتر یان کەمتر<br>وەبەرهێنانی کاتی زیاتر یان کەمتر | سەرچاوەی زیاتر |
| وەبەرهێنانی سەرچاوەی مرۆیی زیاتر یان کەمتر<br>وەبەرهێنانی بوجەی زیاتر یان کەمتر | سەرچاوەی کەمتر |

پێویسته رەچاوی قەبارەی وەبەرهێنانەکە بکەین، بەجۆرێك کە لەگەڵ تواناکانی بەردەستماندا بگونجێت، بۆئەوەی کارەکە بەشێوەیەکی هاوسەنگ و سەرکەوتووانە ئەنجام بدرێت، لەگەڵ خاڵی بەهێزو دەرفەت و قەبارەی وەبەرهێنان و خێرایی دانانی کارەکە لەناو ستراتیجیەتەکەو چۆنێتی وەبەرهێنانی لە پلانی بەگەڕخستنەکەدا، لەمەشەوە دەتوانین چەند ستراتیجێکی گونجاومان دەستکەوێت:

١- دەستپێشخەری کەرتی (المبادره الجزئیه) و، خێرایی ئەنجامدان و قۆستنەوەی دەرفەتەکان لەکاتی هەبوونی رکابەری بەهێزدا.

٢- هەمەجۆری لە ئەرك و پیشەکان، بەگوێرەی ئەو ئەولەویاتانەی بەردەستن و خێرایی گونجاو.

٣- بەئاگایی و خێرایی دانانی کارەکان لەناو ستراتیجیەکان بەگوێرەی بارودۆخ، لەگەڵ گەڕان بەدوای ئەرکی نوێ و بەسوودی زیاتر.

٤- دانانی کارەکان لەناو ستراتیجیەتەکان بە ئاگایی و هێواشی، بۆ کەمکردنەوەی زیانەکان و دۆزینەوەی جێگرەوە.

**هەنگاوی چوارەم: هەڵبژاردنی ستراتیجیەتەکە بەوجۆرەی لەگەڵ قۆناغەکانی پێشوومدا دەگونجێت و، هاوشانی پلانەکەم دەڕوات، وەستاوە لەسەر:**

بـەو پێیەی ژیـان دەجوڵێت و بەردەوام لە گۆڕاندایە، پێویسـتە مەبەسـت و ئامانجەکان مرونەتیـان تێدابێـت، بەپێچەوانـەوە ئەگـەر مـاوە ماوە تـازە نەکرێنـەوە سـودێکی زۆریان نابێـت و، سـەردەمەکە بەخێرایـی کـۆنی دەکات و گرنگیەکـەی لەدەسـتدەدات، هەروەها ئەگـەر بـۆت دەرکـەوت ناتوانرێـت مەبەسـتەکان بهێنرێنـەدی، وازی لێبێنـەو ئامانجێکی واقعـی تـر دابنێ، ئەگـەر یەکێك لـە مەبەستەکانیشـت زۆر سادەوسـاکار هاتە پێشـچاو، هەسـتە بە دانـانی مەبەسـتێکی باڵاتر.

قۆناغـەکان بریتیـن لـەو وێسـتگانەی لـەکاتی رۆیشـتنت بـەرەو ئامانجەکانت مـاوە نا ماوەیـەك تیایانـدا دەوەستیت، جـا ئەگەر مـاوەی نێوان ئـەو قۆناغانە کورت بـوون، ئەوە بەخێرایـی پیایـدا تێدەپەڕیـت، سـەرەنجام ئامانجـە کـورت مەوداکانیشـت بەخێراییـەکی زیاتـر دێنیتـەدی، ئـەم جـۆرە شـێوازەش دەبێتـە هـۆی بەرزکردنـەوەی ورەو ویسـتت و، هەسـتێکی گـەورەی دەسـتکەوتت دەداتـێ و، پڕت دەکاتـەوە لە جۆش وخـرۆش، کە بۆ گەیشـتن بە مەبەسـتی کۆتاییـت پێویسـتت پێیەتی.

خشتەی جێبەجێ کردن و چاودێریکردن، کە بەگوێرەی ستراتیجیە هەڵبژێردراوەکەی پلانی پێشوو دانراوە، لەگەڵ خشتەی بەدواداچوونکردن بۆ ئەو ئامانجە جێبەجێکاریانەی لە خشتەی ئەرکە مانگانەیی یان رۆژانەییەکاندایە:

**١- ئەو شتانە چین هەتا ئێستا جێبەجێ نەکراون؟**

**٢- لەمپەرەکانی بەردەمت چیبوون؟**

**٣- باشترین شێواز بۆ بەدواداچوونی پلانەکەت چییە (جێگرەوەکان)؟**

## نمونەی خشتەیەکی جێبەجێکاری هەموارکراوی پلانەکە، بۆ هەر ئامانجێکی جێبەجێکاری:

| ئامانجە دوورودرێژەکان | ستراتیجیەتی بەدیهێنانی ئامانجەکە | جێبەجێکار یان پاڵپشت | مێژووی دەستپێکردن | مێژووی تەواوکردن | جێگرەوەی کارە ئەنجام نەدراوەکان | تێبینیەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئامانجی زانستی: بەتەواوی قسەکردن بەزمانی ئینگلیزی | تەرخانکردنی کاتێکی رۆژانە بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزی | من و مامۆستا تایبەتەکەم | ٢٠٢٠/٨/١٥ | ٢٠٢٢/٩/١٥ | سی دی فێربوون لەسەر کۆمپیوتەر یان ئەنتەرنێت | گەشتکردن بۆ بەریتانیا یان جێگایەك بەئینگلیزی قسەبکەن |
| ئامانجی رۆشنبیری: ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لە پەرەپێدانی سەرچاوە مرۆییەکان | سەنتەرە باوەرپێکراوەکان یان هاورێیان | من و ... | ٢٠٢٠ /٦/١٥ | ٢٠٢٣/١١/١٥ | سەنتەری کوردی، کۆنفرانس | بەژداریکردن لە کۆنفرانسی گونجاو لەگەڵ پسپۆڕیەکە |
| ئامانجی پیشەیی | | | | | | |

بەدواداچوونی جێبەجێکردن و، خشتەی پێشنیارکراو بۆ پلانی نوێ، دەشتوانیت خشتەی گونجاوی تایبەت بەخۆت بەکاربێنیت.



# قۆناغی پێنجەم

## هەڵسەنگاندن و ڕێککردنەوە

### شیکارکردنی کەلێنەکان

گومـانی تێـدا نییـە هەمـوو کارێـك بـە پـلان دەسـت پێـدەكات و بـە پلانیـش كۆتایی دێـت، هەتـا ئێسـتا پـلانی یەكەمـمان زانی چییە، هەرچـی پلانی دووەمیشـە ئـەوە بریتیە لە قۆناغی ڕێككردنەوەی پلانی یەكەم و هەڵوێسـتەكردن لەسـەر ڕێـژەی كاری ئەنجامدراوو لەمپـەرەكان، ئـەوەش لەڕێگـەی بەدواداچونكـردن بـۆ جێبەجێكـردن و، ڕێككردنـەوەی ئاسـتی ئەنجامـدان، بەگوێرەی ئـەم قۆناغانەی خـوارەوە:

**یەكەم: دانانی پێوەرەكان/ دیاریكردنی یەكەی پێوانە.**

**دووەم: پێوانەكردنی ئاستی ئەدای ڕاستەقینە.**

**سێیەم: بەراوردكـردنی ئـەدای ڕاسـتەقینە بـە پێـوەرەكان (بـەو ئامانجانـەی پـلانی بـۆ دانرابـوو).**

**چوارەم: گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو، ئەمەش پێویستی بە (گونجاوی و روونی) هەیە.**

- گۆڕینی پێوەر/ پێوانەکان.
- گرتنەبەری ڕێوشوێنی راستکردنەوە.
- بەردەوامبوون لەسەر ئەنجامدان و پەرەپێدانی.

**پێنجەم: پێوانەکردنی ئامارەکانی ئەنجامدان (کاریگەری - لێهاتوویی).**

**شەشەم: جیاکەرەوەکانی کارامەیی بەرهەمداریی (تەکنەلۆجیا - هێزی مرۆیی).**

## پلانەکەت بگۆڕەو مرونەتت هەبێت

زانایەك لەکۆتایی پێچاوپێچێکی دورودرێژدا ماسیەکی دانا، پشیلەیەکی برسیشی هێناو لەسەرەتای پێچاوپێچەکەدا داینا، لەسەرەتادا پشیلەکە ڕێگاکەی نەدۆزیەوە، بۆیە بەردەوامبوو لە تاقیکردنەوەی هەموو ڕێگاکان، هەتا گەشت بە ماسیەکە و خواردی، رۆژی دواتر زاناکە ماسیەکی دیکەی هێناو لە شوێنێکی تری ناو پێچاوپێچەکەدا داینا، هەمان پشیلەی برسی بەرەلاکرد، بەهەمان ڕێگای دوێنێدا رۆشت، بەلام نەیگەیاندە ماسیەکە، بۆیە ڕێگاکەی گۆڕی و، ڕێگایەکی تری گرتەبەرو سەرەنجام گەیاندی بەماسیەکەو...خواردی.

دەبێت پێویستیەکانی ڕێککردنەوەی پلانەکەت دابین بکەیت و، توانای رەخنەگرتن لەخۆتت هەبێت و، وەلامی ئەم پرسیارانە بدەیتەوە و، شیکاریان بکەیت:

**١- ئەو ئاستەنگانە چیبوون کە بەسەریاندا زاڵ بویت؟**

**٢- ئەو ئامانجانە چین کە بەدیت هێنان؟**

**٣- ئەو ئامانجانە چین کە بەدیت نەهێنان؟**

٤- چی ڕێگربوو لەوەی بەدیان بهێنیت؟

٥- چۆن بیانهێنمەدی؟

٦- چۆن بزانم ئەوەی ویستوومە بەدیم هێناوە یان پێی گەشتووم؟

## شیکارکردنی کەلێنەکان، دوای قۆناغی هەڵسەنگاندن و ڕێککردنەوە:

١- بارودۆخەکە بەگوێرەی زانیارییە بەردەستەکان هەڵسەنگێنە (باوەڕبوون بەتوانای تێپەڕاندنی کەلێنەکە).

٢- دیاریکردنی جۆری کەلێنەکە، ئایا گەورەیە یان بچووکە؟

٣- ئەو هۆکارو جێدارانەی کە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری گونجاون چین؟

٤- چۆن کەلێنەکە تێپەڕێنین یان پڕی بکەینەوە؟ (دووبارەکردنەوەی پەیکەری دامەزراوەکە، ڕاهێنان، پارە، ....).

خشتەیەکی پێشنیارکراو بۆ رێککردنەوەی پلانەکە، قۆناغی رێککردنەوە....

| تێبینیەکان | جێگرەوەکان | کۆسپ و لەمپەرەکان | رێژەی بەدیهێنراوی ئامانجەکە ....٪ | ئامانجە دورودرێژەکان |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | | | | |
| لەخۆت بپرسەرەوە بەرلەوەی خەڵکی دیکە لێپرسینەوەت لەگەڵ بکەن | | | | |

## بیرت بێ و ماوەماوە بەهای بەتەنها دانیشتن تاقی بکەرەوە

**تێڕامان - بیرکردنەوە - خەڵوەت، لە یاداشتنامەی ئەزمونەکانتدا شت بنووسە**

١- ئایا ئەوەی دەمویست پێی گەشتم؟
٢- ئایا رەزامەندی ناوخۆیی- گونجانی کۆمەڵایەتی - دەستکەوتی دارایی - نەریتی کاری نوێم بەدەستهێنا؟
٣- ئایا کەسایەتی خۆمم کامڵ کرد؟
٤- ئایا خۆم لە کۆت و خەیاڵ پڵاویەکان رزگارکرد؟
٥- ئایا جڵەوی ژیانی خۆمم بەدەستەوەیە و، دەستپێشخەرم لە دەرکردنی بڕیارەکانمدا؟
٦- چۆن پارێزگاری لە رێگا راستەکە بکەم؟

**مانای راستەقینەی سەرکەوتن ئەوەیە هەتا دەتوانیت پێبکەنیت، جێگای رێزی کەسانی زیرەك و، خۆشەویستی منااڵن بیت، شوێنەوارێکی باش لەجیهاندا جێ بهێڵیت، بزانیت کە ژیانی کەسێك بەهۆی تۆوە باشتر بووە.**

## بەکارهێنانی هەنگاوەکانی هەڵسەنگاندن و رێککردنەوە:

١- تەماشاکردنی ئەنجامە لۆجیکیە نزیك و دوورەکان.
٢- تەماشاکردنی لایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکان.

٣- پێوانەکردنی ئاراستەو رادەی ئەنجامی بەدیهێنراوو بەدیهێنراو.
٤- دانانی پلان و ئامانجی گونجاو بۆ سەرلەنوێ دەستکردنەوە بەجێبەجێ کردنی.

هەموو شتێکی دەوروبەرت لەگۆڕانـدان، تەنانـەت ئـەو پلانانـەش کە بەشێوەیەکی تۆکمە دانراون، لـەکاتی جێبەجێکردنیانـدا ناتوانـن هاوشـانی روداوەکان بـڕۆن، لـە راستیشـدا، زۆربـەی پلاندانەران لـەوەدا یەکدەنگن کە هیچ پلانێك نییـە ١٠٠٪ جێبەجێ بکرێـت، ئـەوەش سـەلماوە ئـەو جێگرەوانەی لـە پلانەکـەدا دانـراون بەباشـترین پارێزەر دژی رووداوەکان دادەنرێـن، لەبەرئـەوەی وەك رێگایەك وان بـۆ ئاگادارکردنەوەت لەوەی کـە نابێـت هەمـوو هێلکەکانـت لـە سـەبەتەیەکدا دانێیـت، بەڵکـو پێویسـتە هەندێـك لە سـتراتیجیەتە جێـدارەکان بپارێزیـت و، لـەکاتی سـەرنەکەوتنی سـتراتیژە سـەرەکیەکانتدا هەمیشـە ئامادەبـن بـۆ جێبەجێکردن، ئەم بنەمایە لەسـەرت پێویسـت دەکات هەسـتیت بە گۆڕینـی ئـەو سـتراتیژانەی بەپێـی پێشـبینیەکانت وادەردەکـەون گونجـاو نین.

بەردەوامبە لەسەر شیکارکردنی کارلێکی نێوان خاڵی بەهێزو لاوازت و، چانست لە دەرفەت و ئاستەنگەکانی دەوروبەرت، تەنانەت دوای هێنانەدی هەندێك لە مەبەستو ئامانجە سەرەتاییەکانیشت هەر بەردەوامبە. هەروەها بەردەوامبە لەسەر نەرمی نواندن و بیرکردنەوە لەو ئاستەنگانەی لەڕێگادا رووبەڕووت دەبنەوە، بڕیاردان لەسەر ئەوشتانەی گرنگن و، ئەوشتانەی ناگرنگن دوابخە بۆ ئەوکاتەی وات لێ دێت بەبێ هیچ لایەنگیریەك بتوانیت لەگەڵ بیرۆکە تازەکاندا مامەڵە بکەیت، لەوێدا بۆمان دەردەکەوێت کە بەئاسانی دەتوانیت رێگای چارەسەری جێگرەوە بدۆزیتەوە، ئەگەر هاتوو گۆڕانکاریکردن لە ستراتیژەکاندا هاوکاربوون لە هێنانەدی ئامانج و مەبەستە دیاریکراوەکان.

هیـچ هەنگاوێـکی گـەورە مەنێ ئەگـەر بەتـەواوی لێهاتوو نەبویـت تیایـدا، رێك وەك ئـەو وەرزشـوانەی پیشـەگەرانە جوڵەکانی ئەنجامـدەدات، لەبری ئەوە بەو هێزە شـاراوەی نـاو ئارامگرتـن ئاشـنابەو سـودی لێوەرگـرە، لەسروشـتەوە فێربـە، کـە چەندەها سـەدەیە بەبـێ شـەکەتی و ماندویی و سـکاڵاو بۆڵەبـۆڵ کاردەکات.

> **ئەمڕۆ ئەوکارە دەکەم کە کەسانی تر نایکەن، بۆئەوەی سبەی ئەوە بەدەست بێنم کە کەسانی تر نیانە.**

ئێسـتا ئیـتر کاتی ئـەوە هاتـووە کـردار بکەیـت و بفڕیـت، مـن داوات لێدەکـەم گۆڕانـکاری بـەردەوام لەژیانتـدا بکەیـت و، بـەدوای خەونەکانتـدا بڕۆیـت، بەدەسـتی خـۆت بەختەوەریەکـەت دروسـت بکەیت و دوای خۆت شـوێنەواری مـەزن جێبهێڵیت،

کاتێکیش زیاتر بەختەوەردەبێت، ئیتر هیچ شتێك ناتوەستێنێت و، بەجۆرێك دەژیت کە خۆشت بیرت لێنەکردۆتەوە، خۆت داهاتووی خۆت دروستدەکەیت، ئەرخەمیدس دەڵێت: «بەرزکەرەوەو شوێنپێیەکی پتەوم بدەرێ، هەموو جیهانی پێ دەجولێنم»

کەواتە هیچ کەس یان شتێك نییە بتوانێت بەختەوەرت بکات، چونکە بەختەوەری ئەو بەخششەیە کە تۆ هەموو رۆژێك بۆخۆتی هەڵدەبژێریت، رووبەرووی هەموو تاقیکردنەوەیەك دەبیتەوەو هیچ شتێك ناتوانێت لەچنگتی دەربهێنێت.

**«تەنها ئەوانە دەتوانن هیواکانیان بهێننەدی، کە شتێك دەبینن کەسانی تر نایبینن»**

چارەنووس بەبەخت و ناوچاو نایەتەدی، بەڵکو بریارو بژاردەی خۆتە، شتێك نییە چاوەڕێی بکەیت، بەڵکو شتێکە دەبێت بەدوایدا بڕۆیت و بیهێنیتەدی

داوات لێدەکەم بەرەوپێشەوە بڕۆیت و، ئازایەتی ئەوەت تێدابێت بەدوای ئەو چارەنووسەتدا بڕۆیت، ئەوەش بە کارکردن و جێبەجێکردنی پلانی کارەکەت بەشێوەیەکی رۆژانە.

ئەم پەرتوکەم نووسی، بۆئەوەی ببێتە نەخشەڕێگاو قیبلەنومای تۆو، رێنومایی و هاوکاریت بکات لە دیاریکردنی ئاڕاستەکەت، من داوات لێدەکەم ئەو بیرۆکەو ستراتیجیەتانەی لەم پەرتووکەدایە جێبەجێیان بکەیت، بۆئەوەی ئەوە بەدی بهێنیت کە زۆربەی مرۆڤەکان بەدوایەوەن -کاتی زیاترو خۆشەویستی و بەختەوەری- چونکە مرۆڤی وا هەیە هەموو ژیانی لەخۆئامادەکردن بۆ ژیان بەسەردەبات، جا ئەم پەرتووکە پەیوەندی هەیە بە پلاندانان بۆ ئەو داهاتووەی شایەنی ئەوەیە کاری بۆ بکەیت، بۆیە پێویستە ئازابیت و بەرووی ئاستەنگەکاندا بوەستیتەوە، ئازار شتێکی کاتیە، بەڵام خۆبەدەستەوەدان بۆهەمیشە بەردەوام دەبێت.

**چۆنت پێخۆشە خەون ببینە، هەرکوێت پێخۆشە بۆی بڕۆ، دەتەوێت هەرچی بیت ببە، بەوجۆرە بژی کە پێتخۆشە.**

# گرێبەست لەگەڵ خۆتدا

١- دەتوانیت چیبکەیت بۆئەوەی سەرکەوتووتربیت؟

٢- ئەو شتانە چین بۆ پابەندبوون بە پلانەکەتەوە پاڵپشتت دەبن؟

٣- ئـەو سـەرەنجامە دادگەرانەیـە چییـە لـەکاتی سـەرنەکەوتنی پلانەکەتـدا رووبەڕووت دەبێتەوە؟

٤- چی سـزایەکی گونجـاوی خۆت دەدەیـت، ئەگەربێتـوو لەجێبەجێکـردنی پلانەکەتدا کەمتەرخـەم بویت؟

٥- چـی خەڵاتێـکی خۆت دەکەیـت، ئەگـەر کۆسـپەکانت تێپەڕاند و بەشـێوەیەکی باش بـە پلانەکەتـەوە پابەندبویت؟

بـاوەڕی تـەواوم هەیـە ئـەوەی کـە ویسـتوومەو نوسـیومە زۆر لەگەڵمـدا گونجـاوە و، لەگەڵ شـێوازی تێگەشـتنمدا سـازولەبارە، هەمیشـە هەوڵدەدەم بۆ زیادکـردنی تواناکانم،

بۆئـەوەی لەئاسـت بەدیهێنـانی ئامانجەکانمـدا بێـت، ئـەوەی دەمەوێـت خـۆم بەتەواوی لێـی بەرپرسـم و، تەنهـا پەیوەسـتە بەخۆمـەوە، وە مـن پەیـمان بەخـۆم دەدەم یارمـەتی خـۆم بـدەم، بۆئـەوەی بەرەو باشـتر بـڕۆم و، بەپێی توانای خـۆم یارمەتی کەسـانی تریش بـدەم، هەروەهـا هەسـتم بـە رێکخسـتنی پلانەکـەم و، بـەلانی کەمـەوە مانگـی جارێـك بەدواداچـوونی بـۆ بکەم.

بۆئـەو مەبەسـتەش یەکـەم هەنـگاوی نیمچەکرداریـم دەسـتپێکردووە، کـە بریتیـە لـە پڕکردنـەوەی ئـەو هەمـوو خشـتانەو، وەڵامدانـەوەی ئـەو هەمـوو پرسـیارانە، هەنـگاوە کرداریـیـەکانی دواتریشـم راسـتی و دروسـتی ئـەوە دەسـەلمێنێت.

بەمێژووی / / ٢٠ نوسرا

ناوو واژۆ



# ناوەڕۆك

# التخطيط الإستراتيجي الشخصي

د. محمد مايمون و يوسف منافيخى

## قۆناغەکانی پلانی ستراتیژیی کەسیی

قۆناغی یەکەم: خۆناسین: من کێم؟ چیم بەئەنجام گەیاندووەو، چیم بەدیهێناوە؟ ئەو پەندو وانانە چین کە لەسەرکەوتن و شکستەکانمەوە فێریان بووم؟ ئەو ئاستەنگانە چین بەدەستیانەوە گیرم خواردوە؟ بەها تایبەتییەکانم چین؟ نمونەی باڵای ژیانم کێیە؟ چۆن پیشەی گونجاوی تایبەت بەخۆم هەڵبژێرم؟

قۆناغی دووەم: دانانی دیدگاو پەیام و ئامانجەکانم.

قۆناغی سێیەم: پلاندانان: تایبەتمەندییەکانی پلانی باش، هونەری بەڕێوەبردنی کات، قۆناغەکانی دانانی پلان، خشتەکانی دانانی پلانی مانگانەو هەفتانەو ڕۆژانە، ڕێگاکانی هەڵسەنگاندنی پلان.

قۆناغی چوارەم: ڕێکخستن و جێبەجێکردنی پلانەکە: کاروبارە لەپێشترو گرنگەکان، پلانی بەگەڕخستن، شیکارکردن و ڕێکخستنی هەنگاوو ڕێکارییەکان.

قۆناغی پێنجەم: هەڵسەنگاندن و ڕێککردنەوە: شیکارکردنی کەلێنەکان، پلانەکەت بگۆڕەو مرونەتت هەبێت.

***

ئایا دەتەوێت لەئێستات باشتربیت؟ خەون و ئومێدەکانت بێنیتەدی؟ ئایا دەزانیت ئێستا لەکوێدایت و، دەتەوێت بگەیتە کوێ؟ ئایا پلانت بۆ خۆت و ئاییندەت داناوە؟

### بەڵێ ... ئەوە پلانی کەسییە دەتکات بەکەسێکی جیاواز

بەڵام بیرت بێت! پێویستە ئەو پلانەی دایدەنێیت بۆ بەدیهێنانی شتە دڵگیرەکانی ژیانت بێت و توانای ئەنجامدانیت هەبێت، وە گونجاوبێت لەگەڵ تواناو لێهاتووییەکانتداو دەرفەتێکی زۆرت هەبێت بۆ بەدیهێنانیان.

هەتاوەکو تواناو دەرفەتەکانت لەیەکەوە نزیکتربن، دەرفەتی سەرکەوتنت زیاترو زیاتر دەبێت.

دیزاین: عیماد عبدالقادر

نرخی (٥٠٠٠) دینارە